عەزیز گەردی

# ڕەوانبێژی

## لە ئەدەبی کوردیدا

بەرگی سێیەم

واتاناسی

١٩٧٩

# پێشەکـــی

( ئەوەی پێویستی بە کوتنە لێرەدا ئەوەیە کە من دوو سال خە
بەم بەرهەمەوە خەریك کرد ، بۆ ئەوەم نەبووەو نیيە کـە بیکەم بە
پرۆگرامێك و لەکاتی نووسین و لێکۆلینەوەدا پەیرەوی بکەم ، چونکە ئە
باسێکە سەردەمەکەی لە ئێستا بەولاوەترە ، بەلام ئەوەندە هەیە هە
بە کەلەبەرێکی زۆر گەورە ئەکرد کە هەر ئەبوایە پـر بکرێتەوە ، ئ
ئەمەش پێ بەپێ ئەچوومە پێشەوەو نائەهات زیاتر لەسەری ڕشت ئەبوو.

ئەم قسەیەم لە پێشەکی بەرگی یەکەمی ڕەوانبێژی کـــرد
لەپێشەکی بەرگی دووەمیشدا کوتم :

« ئومێدەوارم . . خوێنەرە دلسۆزو ڕاستەقینەکانی کورد زمان
سینگێکی فراوانەوە وەری بگرن و هەرچی کەم و کورتی هەیە لەسەر
بازلەدەن و بیخەنە بەرچاوانەوە چونکە دیارە ئێمە لە قۆناغی ئێستامان
زیاد لە هەموو کاتەو سەردەمێکی‌تر پێویـــستمان بە ڕەخنەگرتنێکی
ویژدان و ڕەخنە وەرگرتنێکی سینگ فراوان هەیە . . »

لەم دوو قسـەیەی سەرەوەدا دەگەینە ئەم ئەنجام و ڕاستەلیناة
خوارەوە :

١ـ من ئەمویستووە و نـــامەوێ نـــەم کتێبە ـ ڕەوانبێژی ـ بکەم
پرۆگرامێك و لە کاتی نووسین و لێکۆلینەوەدا پەیرەوی بکەم .

٢ـ ڕەوانبێژی بەو شێوە کلاسیيەی کە هەیەو ئـا ئێستا لێی کۆلراوە،
باسێکی سـەردەم تێپـەڕیوە ، کاتی خۆی ڕەواجی هـەبوو بـەلام ئێ
کەوتۆتە نێو پەردەی ڕابردوو و بایەخێکی ئەوتۆی نـەماوە بۆیە ئـە
لەمڕۆ بە تەرازووی ڕەوانبێژی جاران ئەدەب هەلـسەنگێنین وەکو :
وایە پـارەی سەردەمی عوسمانلی ببەینە بـازاڕو بمانەوێ شتی پێ بکڕ

٣ ـ بەڵام سەرباری ئەمەش کەلەبەرێکی گەورە لە ئەدەبو لێکۆڵینەو
ئەدەبی کوردیدا هەبوو کەلەبەری نەبوونی باسێکی زانستی و سەربەخ
ڕەوانبێژی، ئەم کەلەبەرە پێویستی بە پڕکردنەوە بوو دەبوا من یـ
هەرکەسێکی تر چاکی لێ بکا بەلادا و بنچینەی ئەم زانستە بە کورد
و لە ڕوانگەی ئەدەبی کوردی خۆیەوە بۆ کورد داڕێژێ .

٤ ـ نووسینەوەی ڕەوانبێژی شتێکی ئیستەرەم بەو منیش دەستم لێ نەدا
یەکێکی تر هەر دەبوو ئەم کارە ڕاپەڕێنێو بیگەیەنێ بە ئەنجا
شیاوی خۆی ، بەڵام ئەم یەکە کێ دەبوو ؟ و کەی ئەم کارە ئەنجام
رادەپەڕاند ؟ نازانم .

٥ ـ کەمن شانم دایە بەر ئەم کارو پرۆژەیە چاوم لەوە نەبووە و نی
کە کارەکەم ـ خوانەخواستە ـ بێ کەم و کورتی بێ ، یا هیچ ڕەخ
لێ گرتن بە خۆیەوە هەڵنەگرێ . هەر بۆیەش داوام لەخوێنەرە ئازیزەک
کرد کە کەمو کورتییەکانم بۆ دەست نیشان بکەن . ئێستاش ها
بە تەمام

بەڵام لەماوەی ئەم چەند ساڵەی کە بەرگی یەکەم و دووەم لـ
بەردەستی خوێنەراندا بوو . کەم کەس روو بەروو باسی کرد ، تەنیا
یەك کەس کورتە باسێکی دەربارەی بەرگی یەکەم لە رادیۆی بەغ
بلاو کردەوە و یەك برادەری دڵسۆزیش بە عارەبی شتێکی لەسەر بەرگ
دووەم نووسی .

بۆئەوانەی تریش هەبوو رای لێ بوو ، هەشبوو رای لێ نەبوو
بەلایەوە شتێکی زیادەو کەرانەوەیەکی بێ سوود بوو ئەوانەی کە رای
لێ نەبوو وانەبوو لەبەر ئەوە رایان لێ نەبێ کە لێکۆڵینەوەکە باش نەکرا
یا هەڵەو کەمو کورتی زۆرە . بەڵکو لەبەر ئەوەبوو کە وایان دەزا
١

رەوانبێژی ئەوە ناهێنێ پیاو هێندە خۆی پێوە خەریك و مـــاندوو وەختی خۆی ( لێ خەسار بکات ) لەوان وایان دەوێـت کە گوایە کۆن بەبا ئەکرێ و رەوانبێژی مردوو زیندوو ئەکرێتەوە ، ئەگەر ک مەلایەکی پیرو بەساڵدا چوو بیکا ، وەك ئەوەی کە باسی شتی کۆ رەسەن هەر بۆ زاتی بەختیار بێ و باس و خواس و سەرو سۆزانی ؛ هەر بۆ گەنج و تازە هەڵاتووان بێ ! !

بەراستی بیرکردنەوەیەکی سەیرە ! !

بلا با ئەوان وابلێـــن و وا بیربـــکەنەوە ، بەڵام مـن ! ناشارمەوە کە رای من لەم بارەیەوە ئەمەیە : هەرکەسێ یەوێ پێ بکەیەنێ و رۆشنبیری یەکی مکووم و پتەو بـــۆ خۆی پێکەوە بنێ رەگێکی ئوول دابکوتێ و بکەرێتەوە سەرەتاکانی هەرە بەرایی پەیدا رۆشنبیری و لەوێوە پێ دابێ . چ لۆجیك ( ژیر بێژی ـ منطق ) بێ ، چ رەوا چ هەرووز ، چ فەلـسەفە ، چ رەخنە ، چ هەر بـاـبێکی تر . . ئەگەر و نەدەبێتە رۆشنبیرێکی راستەقینەو نەدەتوانێ بەرهەمێکی رەسەن و بە پێشکەش بە بیری مرۆڤایەتی بکات .

هەرچۆنبێ من ئەم رەوانبێژی یەم نووسی یەوە و ئەگەر ئوزقـــ خزمەتی وشەو ئەدەب و کـــولتووری کوردی تێدابێ ، زۆرم ش بەخۆم دێ .

ئنجا لەبارەی ئەم بەرگی سێیەمە ، دەبێ ئەوە بڵێم کە ئەمە شان بەشانی دوو بەرگەکەی تـر زادەی « ١٩٦٨ ـ ١٩٦٩ » بەرگی یەکەم ساڵی « ١٩٧٢ » و بەرگی دووەم ساڵی « ١٩٧٥ » رووناک دی و ئێـستاش وا بەرگی سێیەمت دەخەمە بەردەست کە بریتی یە [ واتاناسی ـ علم المعانی ] . کاتی خۆی چۆنم نووسیبووەوە دەق

وەکو خۆیەتی . تەنیا لە ڕووی ووشەو ڕستەو داڕشتنەوە نەختێ دەستکاریم
کردووە ، ئەگەنا لە بارەی گەوهەری باسەکە خۆیەوە هیچ دەستکاریم
نەکردووە . هەر بۆیەش ئێستا لەڕووی شێوازی لێکۆڵینەوەو پەنا بردنە
بەر سەرچاوەوە رای خۆمم هەیە و ئەگەر ئەمڕۆ باسەکەم بنووسیبایەوە
بە شێوەیەتر دەبوو ، بەڵام نەمویست گۆڕانێکی بنەڕەتی بەسەر باسەکە
دابێنم . چونکە ئەگەرچی بڵاوکردنەوەی ئەم بەرگی سێیەمە دواکەوتو
کەوتە ئەمڕۆ بەڵام بەرهەمی ئەدەبی منەو نۆبەرەی شیعرمەو شـــانازی
پێوەدەکەم و بەبێ گۆڕین و دەستکاری دەیخەمە بەردەستتانەوە .

عزیز کەردی
هـــەولێر
ڕەشەمە ـ شوباتی ـ ١٩٧٨

دووەم بریتی‌یە لە کورتە شی کردنەوەیەکی ڕستەو بنەرەتەکانی بەشی سی‌یەم باسێکی یەکسانی و کورتبڕی و درێژبڕی‌یە ، بەشی چوارەمیش [ پێکەوەنان و دابڕین ] تەرخان کراوە

ئێستاش بەپێی توانا یەك یەك لەم چوار بەشە دەکولینەوە . دیا لێکۆڵینەوەکەشمان کورت‌و پوختەیە ، لە زۆر جێگادا بەدوادا نەچووین درێژەمان پێ نەداوە،لەباتی نموونەی زۆربەیەك نمونەبەسمان کردووەو لەجیا شی کردنەوەی دوورو درێژو تۆژینەوەی لق و پۆیەکان ئەزانامەتمان بەشتی کرد کردووەو دەلیفەی تەنك و بواری تەسك ڕێگەی نەداوین بە پڕوودرێژ بکەوینە شوێن چڵ و لقەکانەوە .

ئەرموو بۆ بەشی یەکەم کە بریتی‌یە لە :

## ( شێوازی نووسین : خەبەرو دارشتن ) .



ا

# - واتـــاناســـی -

ڕەوانبێژی وەك زانستێكی سەربەخۆ [illegible] سێ بەش و هە بەشێك ئەركی لێكدانەوەی لایەنێكی ئەد[illegible] [illegible]یتە ئەستۆ: ڕوونبێژ جوانكاری ، واتا ناسی .

لەبەركی یەكەم و دووەم باسی ڕوون[illegible] [illegible]زانكاریمان كرد .
ئەم بەركەشمان بۆ « واتاناسی » تەرخان [illegible]ردوە

واتاناسی ئەو بەشەیە كە ئەركی لێكدانەوەی ( واتا ) دەكرێتەبا پەیوەندی نێوان ووشەو مانا ساغ دەكاتەوە و لای، هەندێ پرسیاری دەداتەوە كە پەیوەندیان بە ماناو مەبەست و پەیام و كاریگەری ووش ڕستەو ئاخاوتنەوە هەیە . هەر ووشەیەك چۆن بەكاربێ و لەچ شوێنێ بێ باشترە ، پاش و پێش كردنی ووشەكان چۆن كاردەكاتە سەر گۆڕان جەخت كردنی مانای ڕستەكە . بێجگە لەمانای دروست و بەرچاوی خۆ چ مانایەكی تر دەكەیەنێ و چ لێكدانەوەیەكی تر هەڵدەگرێ ؟ ووشە ل كوێ لە كورتی ببڕێتەوە باشترە ؟ ئایا ئەو ڕستەیەی كە هەیە لەكە « باری پێویستە » ی گوێگردا دەگونجێ یان نە ؟ ڕستەكان لە كو بەیەكەوە بلكێن و لەكوێوە لەیەك دابڕێن ، بۆ ئەوەی مەبەستی قسەك بەتەواوی رابگەیەنێ ، بەم جۆرە - واتا ناسی - لە ڕوانگەی پەیوەند نێوان نووسەرو بخوێنەر [ دوێنەرو گوێگر | د.ڕوانێتە ووشەو ڕستە ئاخاوتنەوە ، لەگەڵ ئەو مانایەی دەیگەیەنێ و ئەو كاریگەرەی لەدل دەروونی گوێگردا بەجێی دێڵێ بە شێوەیەكی تێكڕایی - واتاناسی دەكرێتە چوار بەش ، هەر بەشێك لەلایەكی پەیڤەوە دەدوێ . بەش یەكەم بریتییە لە [ شێوازی نووسین ، خەبەرو دارشتن ]

# بەشی یەکەم
# شێوازی نووسین
# خەبەرو دارشتن

### شێوازی نووسین -

بەر لەوەی بچینە سەر باسی ( خەبەرو دارشتن ) کە بڕبڕەی پشتی ئەم بەشەمانە ، واچاکە بەکورتی باسێکی شێوازی نووسین بکەین کە وەکو بەرێنژو ڕێخۆشکەر وایە بۆ چوونە ناو باسەکە .

شێوازی نوسین بریتی‌یە لەو ڕێو شوێن و ڕەنگ و ڕوخسارەی کە نووسەر لە نووسیندا هەیەتی . ئەویش جۆری بیرکردنەوە و هەست و نەست و سۆزو کودازو ووشەبازی و دارشتنی ڕستەو هەر شتێکی دی دەگرێتەوە کە پەیوەندی بە نووسەرو نووسینەکەیەوە هەبێ بێگومان هەر نووسەرێك جۆرە بیرکردنەوەیەك و چەشنە سۆزو خرۆشێك و تەرزە سەلیقەیەکی هەیە لە هەڵبژاردنی ووشەو دارشتنی وەستایانەی ڕستە .

جا نووسەرەکە خۆی چۆن بێ ، نووسینەکەی ڕەنگی کەسێتی خۆی پێوە دیارە . ئەمەش شتێکی زۆر ئاسایی‌یە چونکە کە نووسەر پێکەیشت و پێی خۆی چەسپاندو ڕەنگی خۆی دۆزیەوە ، ئیتر دێ نووسینەکەی مۆرکێکی تایبەتی دەگرێ و هەرکەسە نووسینێکی ئەو نووسەرە بخوێنێتەوە با ناوەکەیشی لەسەر نەنووسرابێ ، یەکسەر دەزانێ ئەمە فلانی کوڕی فلان نووسیویە ، هەر بۆیەشە گوتوویانە . « شێوازی نووسین بریتی‌یە لە نووسەرەکە خۆی . » هەر سەبارەت بەمەشە کاتێك کە دوو نووسەر یان پتر بابەتێك دەکەنە کەرەستەی نووسین هەر یەکە بە جۆرێکی تایبەتی و

بەشێوازی ئالبکرتووی خۆی دەری دەبڕێو نووسینەکان جیاوازیان لێ پەیدا دەبێ

## شـــێوازی چـاك :

هەر نووسەرێك کە شتێك دەنووسێ ، چەند ئامانجێکی هەیە دەیەوێ بیانهێنێتە دی . ئەمانە گرنگترینیانن

١ ـ ئەو بیروباوەڕەی کە هەیەتی دەیەوێ بە خوێنەری بگەیەنێ بۆیە دەبێ وای دەربڕێ کە خوێنەر بە تەواوەتی تێی بگات .

٢ ـ دەیەوێ ئەو هەستو سۆزو ترانەوەی لە ناو دڵیدا وورووژاوە بیخاتە ناو دڵی خوێنەرو هەمان هەست و سۆزیش لە دڵی ئەودا پەیدا بکا . بۆیە دەبێ پەنا بەرێتە بەر ئەندێشەو وەستا کارییەکی ئەوتۆ کە بەهێزترین سـوزی پێ بندا

٣ ـ دەیەوێ سەرباری ئەو بیرو سۆزەی پێی دەگەیەنێ تامێکی تایبەتیشی پێ بداتو وای لێ بکا چێژێکی ئەمر لە نووسینەکە وەربگرێ .

جا کە نووسەرێك بیەوێ ئەم ئامانجانە بێنێتە دی دەبێ شـــێوازی نووســـینەکەی بە جۆرێکی ئەوتۆ بێ خزمەتی هێنانەدی ئەم ئامانجانـە بکات . کەوابوو دەبێ شـێوازی نووســـینی ئەم ســیفەتانەی تیدا بێ

( ئاشکرایی ) تا بەو ئاشکراییەیە بیرو ماناکە بە خوێنەر بگەیەنێ .

( بەهێزی ) ، تا بەو هێزو گڕوزەی تێ یدایە کار لە هەستو سۆزی خوێنەر بکات . ( جوانی ) ، تا بەو جوانییە خۆشـی بڕژێتە دەروونی خوێنەرو شادی پێ ببەخشێ :

ئێستاش شیکردنەوەیەکی تری لەم سێ رەگەزانە :

١ ـ ( ئاشکرایی ) : لەم رەگەزە بەبنچینەی شێوازی نووسین دادەندرێ .

نووسین دەبێ زۆر ڕوون و ئاشکرا بێ، نە لە وانە بێ وەکو مەتەڵ و گرێ لێ دان بە هەمبو کەس ساغ نەکرێتەوە، بەلەو نەش بێ کە دوو نان یا زیاتر هەڵبگرێ و ڕێگای گومانی تێ بچێ، بەڵکو دەبێ ماناکە بەسپی کراوی بداتە دەست بۆ ئەمەش نووسەر پێویستی بە سامانێکی گەورەی زمانە تا بتوانێ ووشەی پڕ بە پێستی خۆی هەڵبژێرێ .

هەروەها دەبێ تەواو شارەزای زانستی زمانەوانیو ڕستە دارشتن بێ بۆ ئەوەی ئەو ڕستانەی دەیانووسێ شلو شۆق نەبن . بێجگە لەمەش دەبێ ڕستەکان لەسەر بناغەیەکی پتەوی ڕێزبەزی دارێژابن پێش هەموو شتێك دەبێ لەگەڵ خۆی و بیروباوەڕی خۆی ڕاستگۆ بێ ، بۆ ئەوەی بەم ڕاستگۆییە بیرو ماناکە بێ پێچ و پەنا بخاتە بەرچاوی خوێنەران .

٢ ) ( بەهێزی ) تەنیا ـ ئاشکرایی ـ بەس نییە بۆ شێوازی بەرزو سەرکەتوو شان بە شانی ئاشکرایی دەبێ شێوازەکە بەهێزیش بێ بۆ ئەوەی کار لە هەست و نەستی خوێنەر بکا بەهێزیش بەم جۆرە دەبێ کە نووسەر بابەت و ڕستەو وێنەی ئەدەبی وا هەڵبژێرێ کە یادو بیرەوەری لە دڵی خوێنەردا زیندوو بکاتەوەو بریندی بکوڵێنێتەوە . دەبێ خەیاڵێکی وای پێ بدا بێ بە پاڵپشتی پتەوکردنی ماناکەو ووروژاندنی سۆزی متبوو ، یا بەهۆی ( نداء ) یەوە دەبێ . بێجگە لەمەش دەبێ نووسەر هەم باوەڕی بە شتەکە هەبێ و هەم شتەکەش سۆزێکی زیندووی دڵی پێشان بدا . تا باوەڕی پتەوترو سۆزی گەرمو بە جۆشتر بێ باشتر کار لە خوێنەر دەکات . هەر شێوازێکیش کە سۆزی گەرمو زیندووی تێدا نەبێ بە مردوویی دێتە دونیاوە

٣ ) ( جوانی ) ئەم ڕەگەزە لە چاو دوو ڕەگەزەکەی پێشوو ئەوەندە گرنگ نییە بۆیە نووسەر تا تەواو مالێ دوو ڕەگەزەکەی تر نەدا

هەق نی‌یە خۆی بەم زەگەزەوە خەریك بكات .

بۆ هاتنە كایەی جوانیش ، جگە لە پیشە ئەشەنگەكانی جوانكاری دەبێ نووسەر خۆی لە ووشەی قورس‌و درێژو ناقۆلاً لابدا و لەسەر یە ئاواز نەیكوتێ تا خوێنەر كەوەڕێ نەبێ‌و پشتی تێنەكا یا وادەبێ جوانی‌یەكە زادەی تەبایی نێوان دەنگی ووشەكازو مانای رستەكان بێ دەنگی دەرەوەو ناوەوەی ووشە دەورێكی زۆری هەیە لــەو جوانی‌یە شێوازەكە پیشانی دەدا

بــە كورتی هەر نووسەرێك كەسێتی خۆی هەیە ، هەر شتێكی ك دەینوسێ هەستی خۆی ، سۆزی خۆی ، بەرامبەر هەیەو كە دەری دەبڕێ بە رەنگی گیانی خۆیەوە بۆیەی دەكات ، بۆیە هەر نووسەرێك بە جۆرێك كار لە خوێنەر دەكات .

بۆ ئەمەش دەبێ هەر نووسەرێك خاوەنی دەنگی خۆی بێ ، لــە گەڵ باوەڕو هەســتو ســۆزی خۆیدا ڕاستگۆ بێ ... نابێ ببێتە ســێبەری ڕۆژكارو لاسای نووسەرانی تر بكاتەوە . بەڵێ ، ڕاستە نووسەر ئاسۆی بیروليكدانەوەی بە خوێندنەوە فراوان دەكات و سوود لــە تاقی‌كردنەوەی نووسەرانی تر وەردەگرێ‌و بەرهەمی ئەدەبی خۆیان پێ دەولەمەند دەكات، بەڵام ئەم سوود وەرگرتنە نابێ بكاتە رادەی لاساكردنەوەو خۆ بزر كردن دەبێ‌تەنیا پەیامی قووڵ‌كردنەوەی تاقی‌كردنەوەی شەوری‌ر لە خەرەكدانی چەشەی ئەدەبی‌و ئارأستەكردنی جۆشێكی دەروونی بێ‌و هیچی تر

## شـێوازو بـاری پێویســت :

بۆ ئەوەی شێوازی نووسین دەوری تەواوی خۆی بگێڕێ‌و مەبەست بپێكێ . دەبێ نووسەر لەكاتی نووسیندا سێ شت رەچاو بكات :

١ ) ئەو شێوازەی کە لە نووسیندا بەکاری دێنێ دەبێ لەگەڵ بابەتەکەی بگونجێ . بابەت تا بابەت دەگۆڕێ . هەیە ئاسان و بەردەستە ، هەیە سەخت و دوورە دەستە . دەبێ شێوازەکە بە گوێرەی بابەتەکە بێ بابەت توند بوو بە توندی بنووسرێ و بابەت ناسک بوو بە نەرم و نیانی بنووسرێ . ئەگەر پێویستی بە رونکردنەوە و چەسپاندن بوو درێژ پێبدرێ ، ئەگەر شوێنەکە تەنگ بوو لە کورتی ببڕێتەوە و ئیشارە بەر روناکی بەس بێ . .

٢ ) دەبێ شێوازی نووسین لەگەڵ جۆری بیرکردنەوەی گرێکردا بگونجێ نابێ لە ئاستی بیرولێکدانەوەی خوێنەران زۆر بەرزتر بێ چونکە ئەگ وابێ بەباشی تێی ناگەن هەر وەکو نابێ زۆر لەو ئاستە نزمتر چونکە خوێنەر زوو وەڕس دەبێ و سر دیشی لێ وەرناگرێ .

بۆ ئەمەش نووسەر لەکاتی نوسیندا دەبێ باری دەروون و ئاستی بیرکردنەوەی ئەو خوێنەرانەی لە بەرچاو بێ کە بۆیان دەنووسێ . دەبێ بزانێ بۆ کێ دەنووسێ ؟ خوێنەرەکانی سەر بەکام چینی کۆمەڵن بیرکردنەوەیان چۆنە ؟ ئاستی رۆشنبیرییان لە چیدایە ؟ لە پێناوی چ تێدەکۆشن و ئامانجیان لە ژیاندا چییە ؟

نووسینی چاك هەر تەنیا بەوە سەرکەوتن وە دەست ناهێنێ کە باسی شتێکی بەرز و بابەتێکی مەزن بکات و زمانێکی پاك و پاراو و شێوازێکی پتەوی هەبێ بەڵکو دەبێ نووسەرەکە پێشتر چاك چووبێتە ناو دڵ دەروون و مێشکی خوێنەران و باش تێیان گەیشتبێ و نووسینی لە خزمەتی ئەواندا بێ و گرفتی ژیانیان چارە بکات .

٣ ) دەبێ شێوازی نووسین لەگەڵ خودی نووسەرەکەدا بگونجێ . واتە ئەو شتەی کە دەینووسێ دەبێ خۆی باوەڕی پێ هەبێ و لە ناخییەوە

هەلبقولێ . خۆ ئەگەر باوەڕی بە شتێك نەبێو بۆ مەبەستێكی تایبەتی باسی بكاتەو لاسای خەلكی‌تر بكاتەوە ، دیارە نووسینەكەی ووشك و برینگ‌ەو بێ تامو بۆ دەردەچێو كارلە خوێنەران ناكات .

شێوازی نووسین لە هەموو بارێك‌دا لە دوو جۆر تێ ناپەڕێ :
یا دەكەوێتە قالبی خەبەر ( الخبر )   یا بە شێوەی دارشتنی ( الانشاء ) دادەڕژێ .

جا باش ئەم كورتە باسەی ( شێوازی نووسین ) دینینە سەر ئەم دوو جۆرەو لێیان دەدوێین . جارێ خەبەر .

# خەبەر

خەبەر ئەو قسە ، یا ئەو پەیامە ، یا ئەو باسەیە کە راستی و درۆ بە خۆیەوە هەڵدەگری . واتە دەشێ خەبەرەکە راست بێ و دەشێ درۆ بێ
با ئەوەش لە بیر نەکەین کە هەندێ خەبەر هەن راستەقینەی زۆر بە دیی و ئاشکراو بەرچاون ، کەس گومان و نکوڵیان لێ ناکات ، بۆیە راستی و درۆییان وەکو رۆژ دیارە . ئەمانەش وەکو : شیرینی هەنگوین سپیاتی بەفرو شیر ، بەرزی ئاسمان روناکی رۆژ ، . . .
هەر خەبەرێك دوو رووی هەیە ، یا دەبێ لە دوو لاوە تەماشای بکەین
١ ـ لە بارەی ماناو ناوەرۆکی خەبەرەکە ، واتە ئەو خەبەرەی لە ناو وشەو رستەکاندایە .
ـ لە بارەی واقیعی راستەقینەی خەبەرەکە . واتە بێ چاودانە خەبەری ناو رستەکان ، ئایا لە واقیعی (موضوعی)دا ، شتەکە راستە یان نا ؟
جا لە ئەنجامی بەرامبەرکردنی ئەم دوو رووەی خەبەر ـ ناوەرۆکی خەبەرو راستەقینەی واقیعی باسەکە ـ بۆمان دەردەکەوێ داخۆ خەبەرەکە راستە یان درۆیە .
ئەگەر مانای ناو رستەکە لەگەڵ واقیعی دەرەوە یەکی گرتەوە ، خەبەرەکە راستە . ئەگەر ماناو ناوەرۆکی رستەکە لەگەڵ واقیعی دەرەوەدا یەکی نەگرتەوە ، خەبەرەکە درۆیە
بۆ نموونە لە رستەی « ئازاد چووە بادینان . » دا لە ناوەرۆکی ئەم رستەیەدا وا تێدەگەین کە یەکێکی ناو ئازاد چۆتە بادینان . ئەمە مانای رستەکە . ئنجا دێینە سەر واقیعی دەرەوە ، ئەگەر ئازاد بە راستی چووبێتە بادینان ، دیارە ناوەرۆکی رستەکە لەگەڵ واقیعەکەدا یەك

دەکرێتەوەو خەبەرەکە راستە. خۆ ئەگەر ئازاد نەچوویتە بادینان، بەڵکو چوویتە شوێنێکی تر یا هەر سەفەری نەکردبێ، ئەو حەڵە دیارە مانای رستەکە لەگەڵ واقیعدا ناگونجێ و خەبەرەکە درۆیە.

بەم جۆرە هەر خەبەرێك ناوەرۆکەکەی لەگەڵ واقیعدا یەك بگرێتەوە راستە، یەك نەگرێتەوە درۆیە (١)

## مەبەست لە خەبەر چییە؟

خەبەر کە دەدرێ لە بنەڕەتدا بۆ دوو مەبەستی سەرەکییە

---

١) هەندێ زانای رەوانبێژی بروایان وایە کە خەبەر هەر تەنیا راست و درۆ نییە بەڵکو شتی تریش دەگرێتەوە. ئەوانە دەڵێن لەکاتی هەڵسەنگاندنی خەبەردا نابێ تەنیا ناوەرۆکی خەبەرەکەو واقیعی دەرەوە بگرێتە بەرچاو بەڵکو دەبێ باوەڕی قسەکەریش رەچاو بکەین. بەم پێیەو بە گوێرەی بۆچوونی ئەوانەوە خەبەری راست ئەوەیە کە ناوەرۆکی قسەکە لەگەڵ واقیعدا بگونجێ و قسەکەر خۆیشی بڕوای پێ هەبێ خەبەری درۆش ئەوەیەکە ناوەرۆکی قسەکە لەگەڵ واقیعی دەرەوەدا نەگونجێ و قسەکەر خۆیشی بزانێ و بڕوای وابێ کەلەگەڵ واقیعدا یەك ناگرێتەوە. بۆیە ئەو زانا رەوانبێژییانە لەو بڕوایەدان بێجگە لە خەبەری راست و خەبەری درۆ هەندێ جۆرە خەبەری تر هەن کە نەراستن و نەدرۆن، ئەویش ئەم جۆرانە دەگرێتەوە

ا ـ ئەو خەبەرەی کە لەگەڵ واقیعی دەرەوەدا بگونجێ بەڵام قسەکەر بڕوای وابێ کە لەگەڵ واقیعیدا یەك نەگرێتەوە

ا ـ مەبەست ئەوەیە ئاوەرزۆکی خەبەرەکە بە گوێگر رابگەیەنرێ ئەمەش لە هەموو مەبەستەکانی تری خەبەر گرنگترو بایەخدارە و پێی دەگوترێ ( خەبەری دروست ـ الخبرالحقیقي ) . هەموو مەبەستەکانی تر دەکەونە رادەی دووەم و پێیان دەگوترێ خەبەری خوازەیی ( الخبر المجازی ) :

ـ نموونەیەك :

بۆ ئەم مەبەستە کە ـ خەبەری دروستە ـ وەکو « دوێنێ کتێبێکم نوێنم کری » ئەگەر مەبەست ئەوە بێ کە ئەو خەبەرە بە گوێگر بگەیەنی . یا وەکو قانیع دەڵێ

مەنعی پێشکەوتن ئەکەن لەم خاکمانە چوار کرۆ
خان یەك ، سەردار دوو ، بەگزادە سێ گوێخا چوار
تایەڵن بۆ خۆم رەحەت بم ، سەربەخۆ ئاوێ بژیم
ئەجنەبی یەك ، مامە دوو ، ئیقتاعی سێ ، ئاغا چوار

---

ب ـ ئەو خەبەرەی کە لەگەڵ واقیعدا بگونجێ بەڵام قسەکەر هەر لە بنەڕەتەوە بڕوای پێ نەبێ .

ج ـ ئەو خەبەرەی کە لەگەڵ واقیعدا نەگونجێ ، کەچی قسەکەر بڕوای وابێ کە لە گەڵیدا دەگونجێ .

د ـ ئەو خەبەرەی کە لەگەڵ واقیعدا نەگونجێو قسەکەر هەر لە بنەڕەتەو بڕوای پێ نەبێ .

جۆری ( أ ، ب ) پێیان دەگوترێ ( خەبەری ناڕاست ) ، جۆری ( ب ، ج ) یش پێیان دەگوترێ ( خەبەری نادرۆ ) ،

کەچی هەندێ زانای دی بەم چەشنەی خوارەوە تەماشای مەسەلەکە دەکەن :

ئانيع كه خه‌به‌رمان ده‌داتێ چوار شت ـ خان ، سه‌ردار ، به‌گزاده .
كوێخا ـ بوونه‌ته كۆسپی رێگای پێشكه‌وتنی وولاته‌كه‌مان ، بۆ ئه‌وه‌یتی
من‌و تۆش له‌م مه‌سه‌له‌یه ئاگادار بین‌و ئه‌گه‌ربۆمان كرا هه‌وڵ ئه‌هێنێ ئه‌م
كۆسپانه ،ده‌ین بۆ ئه‌وه‌ی وولاته‌كه‌مان چی‌تر دوانه‌كه‌وێ
هه‌روه‌ها له دێری دووه‌میش كه خه‌به‌رمان ده‌داتێ چوار شت ـ
ئه‌جنه‌بی ،امه ، ئیقتاعی ، ئاغا ـ ئارلمیان لێ بڕیوه‌و سه‌ربه‌ستی‌یان
لێ زه‌وت كردووه ، بۆ ئه‌وه‌یه ئێمه ئاگاداری ئه‌م راستی‌یه بین .
ب ـ یا خۆد ،به‌ستی خه‌به‌ر ئه‌وه‌یه ده‌بێ كه كوێگر بزانێ قسه‌كه‌ریش
ئاگاداری خه‌به‌ره‌كه‌یه‌و له پشت په‌رده‌ی كه‌ر نه‌ئووستووه بۆ نموونه
ئه‌گه‌ر براده‌رێكت چووبێته سه‌یران و تۆش لایه‌لا ئه‌م خه‌به‌ره‌ت زانیبێ‌و
پاش هاتنه‌وه‌ی براده‌ره‌كه‌ت بچی پێی بڵێی :
برام ، ئێوه ئه‌و رۆژه چووبوونه سه‌یران ! » بێ‌گومان براده‌ره‌كه‌ت

أ ـ ئه‌گه‌ر یه‌كێ خه‌به‌رێك رابگه‌یه‌نێ و خۆی بڕوای به خه‌به‌ره‌كه هه‌بێ
به‌ڵام خه‌به‌ره‌كه له‌گه‌ڵ واقیع‌دا نه‌گونجێ ، ئه‌مه نایێته خه‌به‌ری درۆ ،
چونكه خاوه‌نی قسه‌كه نیازی درۆكردنی نه‌بووه . شته‌كه به راست
تێ‌گه‌یشتووه‌و بڕوای پێ هه‌بووه ( راست ) یش نی‌یه چونكه له‌گه‌ڵ
واقیع‌دا یه‌ك ناگرێته‌وه . جا به‌م جۆره خه‌به‌ره ده‌گوترێ (خه‌به‌ری‌چه‌وت)
ب ـ ئه‌گه‌ر یه‌كێ خه‌به‌رێك بگه‌یه‌نێ‌و خه‌به‌ره‌كه له‌گه‌ڵ واقیعی‌ده‌ره‌وه‌دا
یه‌ك بگرێته‌وه ، به‌ڵام خۆی بڕوای پێ نه‌بێ را تێ بگات كه راست
نی‌یه‌و له‌گه‌ڵ واقیع‌دا یه‌ك ناگرێته‌وه . ئه‌مه پێی ناگوترێ ( خه‌به‌ری ـ
راست ) چونكه قسه‌كه‌ر بڕوای پێ نی‌یه . ( درۆ ) ش نی‌یه چونكه
له‌گه‌ڵ واقیع‌دا ده‌گونجێ . جا به‌م جۆره خه‌به‌ره ده‌گوترێ و خه‌به‌ری ـ
ته‌فره ، وه‌ك ئه‌وه‌ی قسه‌كه‌ر ئه‌فره‌ی خوارد بێ .

ئەم خەبەرە دەزانێ چونکە خۆی چۆتە سەیران ، خۆی باسی خەبەرەکەیە جا کە تۆ ئەم قسەیەی لەگەڵ دەکەیت و ئەم خەبەرەی پێ ڕادەگەیەنی وا نەبێ لەو بڕوایەدا بیت کە برادەرەکەت خەبەرەکە نازانێ و بتەوێ تێی بگەیەنی ، بەڵکو بۆ ئەوەتە وای پیشان بدەی کە تۆ ئاگاداری برادەرەکەت چۆتە سەیران . هەروایشە ، چونکە برادەرەکەت کە ئەم خەبەرەی لە تۆ بیست ، خەبەرەکە هیچی نوێی بۆ ئەو تێدا نی یە ئەوەندە نەبێ کە لەم قسەیەوە تێ دەگا تۆش بە چوونە سەیرانی ئەمت زانیوە مەبەستی تۆش لێرەدا هەر ئەوەندە بوو . ئەم جۆرە خەبەرە پێی دەگوترێ « خەبەری هوشیارکردنەوە » .

## مەبەستی خوازەیی :

بێجگە لەو دوو مەبەستەی سەرەوە ، کە ڕاگەیاندنی خەبەر و هوشیارکردنەوەی کورتکرەو یەکەمیان خەبەری دروستە و دووەم خەبەری خوازەیی یە . . دەشێ خەبەر بێجگە لەم دوو مەبەستە مەبەستی خوازەیی تر بگەیەنێ کە لە ڕەوتی ڕستەکەدا بۆمان دەردەکەوێ . ئەمەش هەندێ لەو مەبەستانە

١ ـ سووربوونەوە : کە قسەکەر شتێکی نازیزو بە نرخی لە کیس چووبێ و زۆری سوو لێ بوو بێتەوەو بۆ ئەوە باسی بکا تا داخ و کەسەری دڵی خۆی پێ دەربیڕێ . حاجی دەڵێ :

حاکم و میرەکانی کوردستان
هەر لە بۆتانەوە هەتا بابان
یەك بە یەك حامیی شەریعەت بوون
سەیدو شێخی قەوم و میللەت بوون

حاجی که لێرەدا ئەو خەبەرەی هێناوە ، بۆ ئەوەی نی یە که خەلکی ئاگاداری مەسەلەکە بێ و بەس ، بەلکو بۆ ئەوەیەتی سووبوونەوەو کول و کۆڤانی دلی خۆی بەرامبەر بە ئەمانی ئەو جۆرە حاکم و میرانەی کوردستان پیشان بدا تا ئەوان مابوون کورد سەریان بلندو رۆژی ئازادی یان لە تاقی ئاسماندا بوو ، کە ئەوان چوون کوردیش کلۆلەی کەوتە لێژی و رۆژی ئازادی لێ ئاوا بوو .

٢ ـ پیشاندانی بێ هێزی وەك ئەوەی مەبەست لە خەبەرەکە ئەوەبێ قسەکەر بێ هێزی و ناگرووری خۆی پیشان بداو شکات لە حالی پەشێوی خۆی بکات مەولەوی دەلێ

پۆس کۆس کۆش نسم کێشا کەم کەم
ئەم سەر ئەو سەرمن دوورینەکەی چەم

مەولەوی باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە پێستی تەپلی گوێی شێ ی کێشاوەو خاو بۆتەوەو دەنگی لێوە نایە ، واتە شت نابیستێ . هەروەها دوورینەکەی چاوی وەرگەڕاوەو شتی نزیك دوور دەخاتەوە ، واتە چاوی کزو بێ هێز بووە . مەولەوی کە ئەو خەبەرەمان دەداتێ مەبەستی ئەوەیە پەیبوونو شپرزەبوونی حالی خۆیمان پیشان بدا

٣ ـ ئاورانەوە لێرەدا مەبەستی سەرەکی خەبەرەکە ئەوە نی یە کە شتێکی نوێ بە قسەکەر بزانیکەیەنێ بەلکو مەبەست ئەوەیە بەو خەبەرە لە کولکر بپاڕێتەوە بەلکو داخوازی یەکەی بۆ جێ بەجێ بکات . وەکو

بێ نەوام ، هیچم نی یە، هاتووم و مەحرووم مەکە
قەحلە دەرگەی خۆی کەدا ناکاتە دەر ، ساحێب کەرەم

لە نیوەی یەکەم بێ نەوایی و دەست کورتی خۆی پیشان دەداو وا

حاجی که خەبەرمان دەداتێ ئەم ئەرزەکۆنە ـ دونیا ـ وەکو هەوا وایەو خەلایقیش ـ خەلکەکە ـ وەکو ڕێبوار و کۆچەر وان . دێن لە هەوارە هەلدەدەن‌و زۆری پێ‌ناچێ خۆیان دەپێچنەوەو دەڕۆن . بۆیە نابێ کەس تەماع لە ژێری چادری شێن ـ زەوی ـ دا بکرێ ... خەبەرەکەم بۆ ئەوەیە که بە بیرمان بێنێتەوە مردنی برا گەورە لێمان چۆتە کەمین مانەوەمان هەتا سەر نی‌یەو هەر دەبێ لە ژووری دوو دەر بچینە دەرێ، جێگا بۆ ئەوەی‌تر بەجێ بێلین ئەم بە بیرهێنانەوەیەش سوودی ئەوەی هەیە که رووده‌کەینە چاکەو ئەفرەت لە خراپە دەکەین

٧ ـ پێشاندانی جیاوازی دوو شت ؛ یەکێ چاك و یەکێ خراپ . بۆ ئەوەی کرێکر دەست بە چاکەکەوە بگرێ‌و پشت لە خراپەکە بکا وەکو قوتابی زیرەك‌و قوتابی تەمبەل نابن بە یەك !! هەر قوتابی‌یەك گوێی لەم خەبەرە بێ هەول دەدا کە خۆی قوتابی‌یە زیرەکەکە بێ نە تەمبەلەکە .

٨ ـ نزاوپارانەوە : وەکو : « فلانی بەهەشتی برادەرێکی نزیکی من بوو . » یا « فلانی خوا لێ خۆش بوو زۆری حەز لە ڕاو بوو . » لەم دوو نموونەیەدا تۆ نازانی داخۆ ئەم فلانە بە ڕاستی بەهەشتی‌یە یان نە . خوا لێی خۆش بووە یان نە کەسیش ناتوانێ بلێ ئەم خەبەرە ڕاستە یا درۆ ، چونکە ئەم قسەیەی دیکەی خەبەرێکی تێدا نی‌یە لەگەل واقیعی دەرەوەدا بگونجێ ، لەوەی کە کەوتۆتە قالبی خەبەریش ، خەبەر نی‌یە . دوعایە ، تۆ دوعای بۆ دەکەی ک. ببێ بە بەهەشتی‌و خوا لێی خۆش بوو

٩ ـ نکوولی مەلا محمدی کۆیی دەلێ

ئەمانخوێندو ئەماندیت و ئەمالیبیست
حەلەمداری لە نێو کوردان هەلسێت

مەبەست بەم خەبەرە ئەوەیە نکول هەلستانی حەلەمدارێك بکات لە نێو کوردان . بە تایبەتی کە نکوولی کردنەکەی زۆر جەخت کردووە ، نکوولیەکە مەیدانی خوێندن و بینین و بیستن دادەگری .

١٠ ـ شانازی : وا دەبێ خەبەر بۆ شانازی بێ . حاجی کە شانازی بە نەتەوەی کورد دەکا . بە دەم ئەم مەدح و شانازیەوە خەبەرەکەمان دەداتێ

خۆ دەزانی سلالەی ئەکراد
لێرەوە بکرە تا دەکاتە قوباد
هەموو زاناو هونەروەرو مێرن
زیرەك و ژیرو ئەهلی تەدبیرن
لە شجاعەت وەکو رۆستەم
بە سەخاوەت وەکو حاتەم
لە کاوان و شوانی کوردەکان یەك
بەسە بۆ لەشکری سەد کەرەدو لەك
مریەکی نێوە سەییادی شەهینە
لەکن ئەمنا فروجە حاجی لەکلەکێ

## چۆنیەتی راگەیەندنی خەبەر :

ئەوەی کە خەبەرێك رادەگەیەنێ ، بە تایبەتی ئەگەر مەبەستی مانای دروستی خەبەر بێ کە رێگەیاندنی باسەکەیەو بەس ، ئەوا دەبێ ئاگاداری

دیارە گرێیەکە مسۆگەرەو هیچ قسەی لە سەر نامێنێ و بەمەوەش گوێگر بڕوای دێتەو دوودڵی‌یەکەی دەڕەوێتەوە .

٣ـ یاوا دەبێ کە گوێگر خەبەرەکە بزانێ ، بەڵام بڕوای پێ نەبێ ، نکوولی لێ بکات . لێرەدا دەبێ نووسەر پێ لەسەر خەبەرەکە دابگرێ ، بەڵام دەبێ پێداگرتنەکەی لە جارێك زیاتر بێ ، بۆ ئەوەی گوێگر لەگەڵی شەییان بێتە خوارێ و بڕوا بێنێ . رادەو شێوەی جەختو پێداگرتنەکەش دەبێ بە گوێرەی ئاستی نکوولی کردنەکە بێ . تا گوێگر زیاتر نکوولی بکات تۆ دەبێ زیاتر خەبەرەکە تەئکید بکەی ئەم جۆرەش پێی دەگوترێ: « دۆخی نکوولی » وەکو بۆ خەبەرەکەی پێشوو بڵێین : « بە زاتی خوا ، دوێنێ خۆم کتێبێکم کڕی » لێرەدا جەخت و پێداگرتنەکە زیادی کرد . جگە لە وشەی (خۆم) کە جەختی تێدایە ، ئەم رستەیە سوێندیشی تێدایە سوێند بە زاتی خوا ، کە ئەم سوێندە خورا ئیدی هیچ قسە نامێنێ ، نکوولی گوێگر هەر چەند زۆرو قەبەش بێ هەمووی لەبەردەم ئەم سوێندە گەورەیەدا دەترێتەوە .

## هەندێ سەرنج

لەم هەر سێ دۆخەی خەبەر ( ساکار ، داواکاری ، نکوولی )کوتمان دەبێ چۆنیەتی راگەیاندنەکە لەگەڵ باری تایبەتی گوێگردا بگونجێ لە دۆخی ساکاردا خەبەرەکە بە سادەیی دەدرێ . لە دۆخی داواکاری‌دا خەبەرەکە یەك جار جەخت دەکرێ لە دۆخی نکوولی‌دا خەبەرەکە دووجار یا زیاتر جەخت دەکرێ جەخت کردنەکەش بە گوێرەی باری گوێگر دەگۆڕێ . بۆیە زۆر چەشنە جەخت کردن هەیە . یا جەخت بە زۆر جۆر دەبێ ئەمانە هەندێکیانن :

١ )ئــه‌كه‌ر وا پێهان بڎا که کوێکر پرسیارێکی کردووه یا باسی شتێکی کردووه ـ له راستیشدا شتی وا له گۆڕێدا نه‌بێ ـ ئنجا بیه‌وێ وه‌ڵامی پرسیاره نه‌کراوه‌که‌ی بداته‌وه‌و باســـه نه‌کوتراوه‌که‌ی بۆ ته‌واو بکات . بێ که‌س ده‌ڵێ

باسی مه‌حزوونی‌و که‌ســـاسی خۆت مه‌ نه‌ تو‌خوا وه‌ته‌ن
چونکه بـــه‌و بـاســــه برینو زامه‌کـــه‌م ده‌کولێته‌وه

ئه‌م خه‌به‌ره وا ده‌گه‌یه‌نێ که (وه‌ته‌ن) باسی خۆی کردبێ ، بۆیـــه به‌رپه‌رچی ده‌داته‌وه‌و به ره‌سته‌یه‌کی دارشتن ـ انشائی ـ ده‌ڵی باسی خۆت مه‌که‌و پاشان هۆی ئه‌م داوایه رون ده‌کاته‌وه ئه‌ویش ئه‌وه‌یه که‌هه‌م باسه برینه‌که‌ی دێته‌وه سوێ .

٢ ) یا وا ده‌بێ که کوێکر خۆی خه‌به‌ره‌که بزانێ . به‌ڵام له خه‌به‌ره‌که‌دا وا دیار بێ که کوێکر ئاگای لێ نی‌یه بۆ ئه‌وه‌ی بـه هۆی ئه‌م بایـه‌خ پێنه‌دان‌و پشت کوێ خستنه ووریا بێته‌وه‌و دان به ناوه‌رۆکی خه‌به‌ره‌که دابنێ . وه‌کو ئه‌وه‌ی که یه‌کێ لـه‌گه‌ل دایك‌و باوکی خۆی خراپ بێ‌و تۆش پێی بڵێی : « کوڕم ئه‌مانه دایك‌و باوکی تۆن » . بێ‌گومان کابرا ده‌زانێ ئه‌مانه دایك‌و باوکی ئه‌ون . به‌ڵام تۆ که ده‌یکه‌یته خه‌به‌رێك بۆ ئه‌و وه‌ك ئه‌وه‌ی لێ‌دێ که کابرا پێشتر نه‌یزانیبێ ئه‌مانه دایك و باوکی ئه‌ون .. که زانی ئیتر ده‌بێ بۆیان باش بێ .

٣ ) به دووپات‌کردنه‌وه‌ی ووشه‌که وه‌کو « چه‌وۆکم خوێنده‌وه چه‌وۆك » یا وه‌کو شیعره ناوداره‌که‌ی نالی که ده‌ڵێ :

بحمدالله دوچاوی یـارم ازخـــه‌ی
به‌ێ مه‌ی‌یامه‌ستی بێ مه‌ی مه‌ستی بێ مه‌ی

لە بوستانی لەمەدا لەت نی‌یە وەك
شەمامەی وەك شەمامەی وەك ئەمامەی
کوتی نالی لەتۆ بمرە ئەمن دلم
خەداکەی بێ خوداکەی بێ خوداکەی

٤ ) بە هۆی بەکار هێنانی هەندێ ووشەوە :

أ ـ راناوی ـ خۆ : وەکو « من خۆم چووم . »

ب ـ هەر کامەران دەلێ :

بەڵام هەر ئەبێ شەفەق دەرکەوێ
کورد لەم هەورازە سەختە سەرکەوێ

ج ـ قەت هەردي دەلێ :

قەت نەدەی ئازاری گیانی مەست و بێدارانی شەو
خۆت نەخەیتە بەر شەپۆلی نەشکێ بێ پایانی شەو

د ـ هەرگیز (١) : گۆران دەلێ

بەڵام تەبیعەت هەرگیزاو هەرگیز
بێ روناکی‌یە ، بێ بزەی ئازیز

ه ـ بەدی (٢) بەدی چوومە بادینان .
لە وەڵامی « تۆ نەچوویتە بادینان ؟ » .

و ـ بە سوێندخواردن : وەکو لەم سوێندەی بێ کەس :

---

(١) نابێ ئەوەش لە بیر بکەین کە ووشەی هەرگیز هەمیشە لە ر.
( نەفی ) دا دێ .

(٢) ( بەدی ) هەمیشە تەئکیدە بۆ وەڵامی پرسیارێکی نەفی ...

بەو خودایەی بێ شەریکو لامەکان و واحیدە
عەشقی تۆ ئەومن لە دلما ئاگری کردۆتەوە
ئاگرێکی وا هەزار ساڵ ئاوی بڕژێتە سەر
ئـــەت کـــرو کلپەو بلێسەی تا ئەبەد ناکوژێتەوە

* * *

# دارشــتن

دارشتن ئەو گۆتەیەیە کە راستەو درۆ بە خۆیەوە هەڵناگرێ . چونک ئەو مانایەی کە تێیدایە هیچ واقیعی دەرەوەی نییە تا بزانین داخۆ لـەگەڵی دەگونجێ یا ناگونجێ وەکو

مەڕۆ بۆ مردن بمرە بۆ ژیان
چۆن قازانج ئەکەی تا نەکەی زیان

ئەمە نەهێشتن و فرمان و هاندانی تێدایە ئەمانەش چاکەو خراپە هەڵدەگرن واتە دەشێ نەهێشتنێک یا فەرمانێک یا هاندانێک چاک بێ یا خراپ بەڵام ئەمە مانای وا نییە کە راستە یان درۆیە چاکەو خراپە شتێکەو راستەو درۆ شتێکی ترە

دارشــتن دەکرێتە دوو بەش

یەکەم داخوازی - طلبی -

دووەم : بێلە داخوازی - غیرطلبی -

دارشتنی داخوازی ئەوەیە کە داوای شتێکت لێ دەکات . ئەو شتە لە حالی داواکەدا هێشـتا نەبوە . ئەگەر بووبێ و بابێتەوە مانای وایـە داخوازییەکە بۆ مانای دروسـتی خۆی بـە کار نەهاتووە . مانایـەکی خوازەیی دەگەیەنێ دارشـتنی داخوازی زۆر لق و پۆپی لێ دەبێتەوە ، ئەمانە هەندێکیانن : ( فەرمان ، نەهێشتن ، پرسیار خۆزی ، بانگ ). کە لە پاشان بە درێژتر باسیان دەکەین .

بەڵام دارشــتنی ( بێلە داخوازی ) ئەوەیە کە هیچ داواو هاندانی تێدا نەبێ . هیچ شتی وابشــی تێدا نەبێ کە زووی داپێو برابێتـەوە و مەبەستی پێ شتێکی تر بێ . ئەمەشـیان هەندێ جۆری هەیە وەکو

( عاجباتی و سوێندو هێڤی - رجاء - ) (١)
• عاجباتی حەمدی دەڵێ :
بەه بەه چ رۆژێکی نەوە
هەی هەی چ عومرێکی نەوە
عاجباتی ئامرازی خۆی هەیە ئەمانە کەمێکیانن :
١ - بەه ، بەه
وەکو شیعرەکەی حەمدی !
٢ - هەی ، هەی
٣ - پەککو پەککو لەم ئاسمانە شینە !
٤ - ئەحا ئەحا لەو حەشامەتە !
٥ - هەیهو : هەیهوو لەو سەیرانە !
٦ - تواهوو ! تواهوو ! لە مێژە پەڵەی داوە !
٧ - ئاخ ئاخ لە دەست چەرخی چەپکەرد !
٨ - حەیف ، مخابن : سەد حەیف و مخابن دنیایێم دەمێنێ چەتۆ بە دەستی تیرۆی برینداره .
٩ - دەك : دەك خەجاڵەت بی !
١٠ - ئۆخەی : ئۆخەی ئەمجارەش بە دیداری جگەرگۆشەکەم شاد بووم !
١١ - ها ها ئەمە زیاتر بۆ سەرکۆنەکردنە
ها ها کورم ئیشی وا چۆن دەکەی !
• سوێند : زۆر جۆرە سوێند هەن ، لەمانە هەندێکیان

(١) زاناکانی رەوانبێژی ئەم بەشەیان داڕشتن بە شتێکی بێ بایەخ دەزانن و خۆی پێوە خەریك ناکەن . بەڵام ئێمە وامان بە باش زانی بە کورتی باسی خۆی و بەشەکانی بکەین .

١ ـ ئایینی : بە خواو پێغەمبەرو قورئان .
٢ ـ نەتەوایەتی‌و نیشتمانی : بە خاک‌و نەتەوە
٣ ـ خزمایەتی : بە خزم‌و کەس‌وکار .
٤ ـ یادی بیرەوەری : بە گۆڕی مردووان .
٥ ـ بەرەو دوو : سوێند بەسەری ئەو کەسە یا ئەو جەماعەتەی لــە کەلیان دەدوێ
٦ ـ مەعنەوی وەکو برایەتی ، خۆشەویستی ا

هێڤی :

هێڤی ئەوەیە داوای شتێ لە یەکێك بکەی یا شتێکی ان رەچاوبکەی‌و ئەو شتە لەوانە بێ بێتــە دی . ئەگەر ئەوانـە نەبێ بێتــە دی دەبێ بــە خۆزی ـ تمنی ـ . هێڤی خواستن بە هۆی هەندێ ئامراز دەبێ وەکو
١ ـ هیوا : دلدار دەڵێ

هیوام بــە تۆیــە ئەی تازە منال
بــەیانی ببیە نموونەی میـــال

٢ ـ تکا : تکایە ئەمڕۆ مەچوە سەلەری .
٣ ـ توخوا : ئەمە ئامرازی هێڤی خواستنەو پاڕانەوەشی تێدایە :
« توخوا ئەگەر سەردانێکی کوندەکەمان نەکەی ا » . ئەمە پوختەیەکی دارشتنی پێلە داخوازی ننجا دارشتنی داخوازی کە ئەم شانە دەکرێتەوە:

یەکەم : فەرمان (الأمر) ئەوەیە کە یەکێ لە روانگەی دەســـەلات و گەورەییەوە داوای جێ بە جێ کردنی کارێك لـــە یەکێکی لە خۆی بەرەژێرتر بکات . وەکو : دلدار دەڵێ :

پێی ووتم پیرەی سمێڵ کلکەبە
یا تاپۆ بدە یـــا پارکەو بڕۆ

ئەمەش پێی دەگوترێ فەرمانی ( دروست ـ حقیقی ) جاری وا هەیە فەرمان لە مانای دروستی خۆی دەردەچێ کە داوای بەجێ هێنانی کارێکە لە رووی زەبربەدەستیەوەو مانایەکی‌تر دەکەیەنێ کە لە رەوتی رستەکەدا دەردەکەوێ ، ئەمەش پێی دەگوترێ فەرمانی ( خوازەیێ ـ مجازی ) . .

ئەمەش هەندێك لەم مەبەستە خوازەیی‌یانە

پاڕانەوە  ئەو داوایەیە کە بچووکو بێ‌هێز ، لە گەورەو زەبر بەدەستی دەکات . بێ‌کەس دەڵێ

خوایە بمخەیتە جەهەننەم ئەچمە ریزی وەحشیان
جەنەتی چی ؟ بێتو وابێ عـەینی تیمارخانەیـە

بێ‌کەس لـە دەست بێزاری خۆیەوە . داوا لـــە خوا دەکات بیخاتە دۆزەخەوە . داواکەی بۆتە پاڕانەوە . نەك فەرمان .

داوا  ئەگەر هەردوولا هاوزێ یـەك بن . وەکو ئـەوەی تۆ بـە برادەرێکت بڵێی : « هەستە برۆ قوتابخانە ! »

• خۆزی : ئـــەو کاتـەی داواکراوەکە زۆر تازیز بێو هیوای هاتنەدی نەکرێ . « ئەی دەردە مردن ، بەرۆکی ئەم خەڵکە بەردە ! » مردن بێ‌و بەرۆکی خەڵك بەربدا ؟ ئاواتێکی گەورەیە ، بـەڵام کوا ؟

• هەڕەشـە  ئەوەیە فەرمانە کە هەڕەشـــەی تێدابێ وەکو : « لـەی داگیرکەری نەگریس ، پێ لەســـەر خاکەکەمان هەڵگرە ! ئەم فەرمانـە هەڕەشەو گوڕەشەی تێدایە .

• ئامۆژکاری  ئەحمد موختار بەگ دەڵێ

بخوێنن چونکە خوێندن بۆ دیدەی تیفی دوژمنتان
هەموو ئانو زەمانێ هەیبێ تەلفان و سوپەرتانە

• پەك خستن : ئەوەیە کە فەرمانەکە بۆ تەحەدداو پەك خستنی کرێکێ بێ . وەکو : « وەرە روژێك لە جێی من کار بکە ! » واتە کاری من بە تۆ راناپەڕێ .
بێ کەس دەڵێ

کەر ئەتوانی بە دەمیە          بفڕە بچۆرە ئاسمان

سەرپشك : ئەوەیە فەرمانەکە بۆ ئەوەبێ کرێکر لە دوو شت یا پتر یەکێ بۆ خۆی هەڵبژێرێ . ( ئەدەب ) دەڵێ

تا چەند بە صبر و ستەم ئەو بیم و ئومێدە !
یا بمکوژە یا رووم بدەیە. خەوف و رجا چەند ؟

( ئەدەب ) یارەکەی لە دوو شت کردۆتە سەرپشك ـ یا ئەوەتە بە یەکجاری بیکوژێ ، یا روویەکی بداتێ و لایەکی لێ بکاتەوە ـ
• عاجباتی : دلدار دەڵێ :

بڕۆ ئاو ئاپەدو سەیری چە پڕۆز جاویدانێکە
ئەم فەرمانە بۆ سەرسوڕمانە !
• هاندان : بێ کەس دەڵێ :

لاوانی وەتـــەن          غیرەتێ بکـــەن
دەی هەستن لەخەو          وا بە سەرچوو شەو

• بێجگەم لەم مەبەستە خوازەییانەی سەرەوە فەرمان زۆر مەبەستیش دەکەیەنێ بەلام ئێمە بەوەندە وازمان هێنا .

## جۆرەکانی فەرمان :

فەرمان لە کوردیدا بە دوو جۆر دەبێ :

أ بە هۆی بەکار هێنانی کرداری داخوازی . وەکو کاکەی فەلاح دەڵێ

مل ڕێ بگرەو بڕۆ بۆ بەرزی

یا سەرداریە یا سەرداریە

« بگرە . بڕۆ » کرداری داخوازین و فەرمانەکەیان پێ کراوە .

ب ـ بە هۆی بەکارهێنانی (با) لەگەل کرداری ڕانەبردووی هیچی خراستنەوە . وەکو :

شەونێ لەیلانێ لەیلانێ

هەمە با بچینە سەیرانێ

( با بچین ) بریتی یە لە ( با + کرداری ڕابوردوو )

سەرنج : بێجگە لەم دوو جۆرە فەرمانەی سەرەوە جاری وا هەیە فەرمان دەکەوێتە قالبی کرداری ڕانەبوردوو . ئەمەش ئەوکاتە دەبێ کە ئەوەی فەرمانە کە دەردەکا لە چاو ئەوەی فەرمانە کەدەکا زۆر بەهێزبێ . وەکو تاغا یەك بەمسکینە کەی دەڵێ: ە بەیانی دەچیتە فلانە دێ اە وابڕۆ فلانەدێ ...دەبێ هەر بچیە ...

دووەم : نەهێشتن ـ النهی ئەمەش جۆر فەرمانە ، بەڵام نەك فەرمانی جێ بەجێ کردنی کارێك بەڵکو فەرمانی نەکردنی کارێك کە کوێکر خەریك بێ یا بە تەمایێ یا لەوانە بێ بیکات . داواکەش دەبێ لەڕووی دەسەڵات و دەست ڕۆیشتنەوە بێ ... بەمەوەش نەهێشتنەکە دەبێ ب ٩ نەهێشتنی ( دروست ) خۆ لەگەر لەو مەبەستە دەربچێ مەبەستێکی تر بگەیەنێ ئەو حالە مەبەستەکە دەبێتە خوازەیی

نەهێشتنی دروست وەکو :

« کوره ، ئەچی بۆ ئەو دەم ئاوە ! »

ئامرازی نەهێشتن :

لە کوردیدا دوو ئامرازی نەهێشتن هەیە :

ا ـ مە . وەکو : کەرە مەمرە بەهارە
کورئانتێزدێ لەشارە

ب ـ نە . وەکو : هەردی دەڵێ
ئەکەی خۆت خەیتە بەرنێعکی دوو ئەبرۆ تا نەکوژراوی .

سەرنج : ئەوەی شایەنی کوتنە ئامرازی (نە) لە کرمانجی خوارو نەهێشتنێکی توندوتیژ دەکەیەنێو لە (مە) بەهێزترە . لە کرمانجی سەروودا کتومتجێگەی (مە) دەگرێتەوە . وەکو : نەکە ، نەچە .

ئەمەو ، تنها نەهێشتنی خوازیی . ئەویش ئەوەیە کە رستەکە مانای خۆی دەربچێو مانایەکی تر بکەیەنێ کە لە رەوتی رستە دەردەکەوێ . ئەم مانا خوازیییەش بۆ زۆر مەبەست دەبێ ئەمانە مەندێکیانن :

• پارانەوە . مەلای کۆیی دەڵێ :

ئەم زولمە زپوڵ ئەکەی خودایە
ئەسلا ئەمەلم بە کەس نەمایە

هەر چەندە ئەم رستەیە نەهێشتنە ، بەڵام نەهێشتنەکە خورتی و ز تێدا نییە ، بەلکو بۆتە پارانەوە ، بەڵام پارانەوەیەکی زۆرە چونە ئامرازی ( لە ـ نەکەی ) تێدایە کە نیشانەی توندوتیژییە . بەکاره ئەم ئامرازەش رادەی زۆری زولمەکە پیشان دەدا

• ـ تکا : پیرەمێرد کەس دەڵێ :

باسی مەحرومی‌و کەساسی خۆت مەکە ، توخوا وەتەن !
چونکە بەو باسە برینو زامەکەم دەکولێتەوە
ئەمە تکایەکە - بێ کەس - لە نیشتمانی دەکات ، ئەك ئەهێشتن بێ
بۆیەش تکای لێ دەکا چونکە باسەکە برینی کۆنی دەکولێنێتەوە . جاداخۆ
نیشتمان بە گوێی دەکا ؟ لە باس کردنی کەساسی خۆی دەوەستێ ؟
• ئامۆژگاری پەندەکە دەڵێ « مەڕوانە سەری تاس ،
بڕوانە بەختی خاس »
دلـــدار دەڵێ :

| | |
|---|---|
| ووتی ئەوجا بەسە نەفام | گوێت لێ بێ رۆژی بۆت بڵێ |
| وەختێ شتێکت کرتە دەم | کەر دەبێ کۆرانی مـــەڵێ |

• هەڕەشە : دلدار دەڵێ
کوێخاکە ووتی سەلامەت نەبی
وەکوێرایی چـاو ، وەملی شکار .
• نـائومێدی : مەلای گزیی دەڵێ
سـووری موو زەردەی چاوشین نەکەی بە ئومێدی بی
ئـەوەل بـــە ئەرەتی خۆت دوەم بـــە ‌هەونی رەبی
بۆ ئەوەیەتی گوێگر بە تەواوەتی لە سووری مووزەردی چاوشین -
(ئینگلیز) بێ ئومێد بێ کە هیچ خێری لە نێوچەوانی‌دا نی‌یە و لە زەزەر
بەولاوە ئازانجی کەلانی لێ رەچاو ناکرێ .
دلدانەوە : وەکو « کوێ مەدەرێ »

## سێیەم : پرسیار ( ئیستیفهام )

پرسیار ئەوەیە کە داوای زانینی شتێك بکەی پێشتر نەتزانیبێ ، نەیزانی ، بۆ ئەوەی تۆش ئاگاداری بیت . وەکو : « یەکەم رۆژنامەی کوردی ناوی چی بوو ؟ » ئەمە ئەگەر تۆ شتەکە نەزانیو بتەوێ بیزانی ئەمەش مانای دروستی پرسیارە . وەکو ئەمە هەیە ئەوەش هەیە کە مەبەست لە رستەی پرسیاری زانینی شتەکە نەبێ بەڵکو مەبەست گەیاندنی مانایەکی تر بێ کە لە رەوتی رستەکەدا دەردەکەوێ . ئەمەش پێی دەگوترێ مانای خوازەیی ـ مجازی ـ .

ئەو شتەش کە دەتەوێ بیزانی ، واتە پرسیاری دەرهەق بکەی سێ جۆرە

١ ـ یا وا دەبێ کە پرسیار دەکەی مەبەست ئەوە بێ پێوەندی نێوان دوو شت بزانی . ئاخۆ ئەو پەیوەندییە هەیە یان نییە . بۆیە وەڵامەکەی یان ( بەڵێ ـ ئا ) دەبێ ، یان ( نەخێر ـ نا )

کە دەپرسی ئایا زێر ژەنگ هەڵدێنێ ؟ مەبەستت ئەوەیە بزانی پەیوەندی لە نێوان زێرو ژەنگدا هەیە یان نییە . چونکە دوودڵیت و بە تەواوی نازانی داخۆ ئەم پەیوەندییە هەیە . جا ئەگەر پەیوەندییەکی هەبێ وەڵامەکە وا دێتەوە : « بەڵێ ـ ئا ـ زێر ژەنگ هەڵدێنێ . » خۆ ئەگەر پەیوەندییەکە نەبێ ـ کە لێرەدا ئەمەیان راستە ـ وەڵامەکی بەم جۆرە دەبێ : « نەخێر ـ زێر ژەنگ هەڵناهێنێ . »

ئەم جۆرە پرسیارە بە هۆی ئەم ئامرازانەوە دەبێ

ـ ئایا : ئایا بەهاران باران دەبارێ ؟

ب- ئەرێ (١) ئەرێ دوێنێ هاتیتە سەیران ؟
ج- چما : « چما تۆ چوو بووی بۆ بادینان ؟

وەکو بەهۆی ئەم ئامرازانە دەبێ . بەبێ ئامرازیش دەبێ . وەکو : سوارەکانت دی ؟ لێرەدا ئەگەر بە نووسین بێ بەهۆی نیشانەی پرسیارەوە دەزانین کە پرسیارەو خەبەر نییە . ئەگەر بە قسەش بێ بەهۆی پەردەو ئاوازی دەنگەوە دەزانین کە خەبەر نییەو پرسیارە

هەر لەبارەی ئەم جۆرە پرسیارەوە کە - بەلێ - و - نەخێر - هەلدەگرێ ، دوو جۆرمان هەیە :

أ - پرسیاری نەفی ئەوەیە پرسیارە نەفی تێدابێ وەکو : ( کتێبەکەت نەخوێندەوە ؟ ) لێرەدا، کە کتێبەکەت نەخوێندبێتەوە دەلێی ( نە - نەخێر - ) . بەلام ئەگەر خوێندبێتەوە، وەلامەکە بەهۆی ( با ) یا ( بەلێ ) دێ : با خوێندمەوە . ) بەلێ خوێندمەوە . )

ب- پرسیاری بوون : ئەوەیە پرسیارەکە نەفی تێدانەبێ . وەکو ئایا کوێستان ڕێتکە ؟

٢ - یا وا دەبێ پرسیارەکە سەرپشکی تێدابێ . واتە دووشت یا زیاتر بدانێ بۆ ئەوەی لەمانە وەلامە ڕاستەکە هەلبژێرێ .

لێرەدا پرسیارکەر وە نەبێ هەر هیچ لە مەسەلە کە نەزانێ . با دەزانێ بەلام زانینەکەی لە چوارچێوەیەك دایە . وەکو : « تۆ هاتی یا برات؟ » لێرەدا تۆ دەزانی یا واتێدەگەی کە دەزانی هاتنەکە بەو لە نێوان دوو کەس دایە ( تۆ - برات ) بەلام نازانی لەم دووانە کامەیانە هاتووە

(١) ئامرازی ( ئەرێ ) ئەگەر لەگەل کرداری ڕانەبردوو بێ دەبێتە پرس پێکردن ئەرێ دێی بچینە بازاڕی واێ ؟ ، خۆ ئەگەر لەگەل کرداری ڕابووردوو بێ دەبێتە جێگەی گومان : ئەرێ هاتی ؟

وەلامەکەش دیارە . ئەگەر هاتنەکەی بووبێ و لە نێو ئەو دووکەسەدا بێ دەڵێ : « من هاتم . » یا « برام هات . » یا « هەردووکمان هاتین ، خۆ ئەگەر هاتنەکە نەبووبێ و هەر لە پێچدا سەرچێخ چووبێ ئەوا وەلامەکە وا دەگەڕێتەوە « کەسمان نەهاتین » یا « نەمن هاتم ، نەبرام» یا بە هەر جۆرێکی تر کە هاتنەکە لە هەردوولا دوور بخاتەوە . یا وەکو نالی دەڵێ :

ئایا بە جەمع و دایرەیە دەوروەکانی با
یاخۆ بوە بە تەفرەقەیی شۆرشی لەسوور

٢ ـ یا وا دەبێ کە پرسیارکەر لایەنێکی شتە پرسراوەکە نەزانێ و بیەوێ بیزانێ . لێرەدا پەنا دەباتە بەر ئامرازێکی پرسیار کە داوای رونکردنەوەی ئەو لایەنە نەزانراوە، پێ لە کورتکرن دەکات ، وەکو : « کۆماری مەهاباد کەی دامەزرا ؟ » لێرەدا دەیەوێ ئەو کاتە بزانێ کە کۆمارەکەی تێدا دامەزراوە . ئامرازی پرسیاریش زۆرن پاشان باسی هەندێکیان دەکەین .

## شێوەی پرسیار :

لە کوردیدا ، بە شێوەیەکی گشتی بە دوو جۆری پرسیار دەکرێ :
١ ـ بەبێ ئامراز ئەوەیە کە رستەی پرسیاری هیچ ئامرازی تێدا نەبێ وەکو : « ئەرزاد چۆنە هەورلتان ؟ » لێرەدا ـ وەکو باسمان کرد ـ ئەگەر بە نووسین بوو بە هۆی نیشانەی پرسیارەوە دەزانین پرسیارە . ئەگەر قسەش بوو بە هۆی پەردەو تەبەقەی دەنگەوە
٢ ـ بە ئامراز : ئەو پرسیارەیە کە بە هۆی ئامرازێکەوە داوای زانینی رووبەکی مەسەلەکە بکات . ئامرازی پرسیار لە کوردیدا زۆرن

• ئایا : ئەمەش بۆ ساغ کردنەوەی بوونو نەبوونی پەیوەندی لێوان دوو شتە . وەکو

«ئایا ئەوزاد چۆتە کوێستان ؟»

لەم جۆرە پرسیارەدا دەشێ ئامرازەکە فڕێ بدرێ و بەهۆی پەردەی دەنگەوە پرسیارەکە بکەیەنرێ . وەکو ئەوە دەبێ کە ـ ئایا ـ لابرێ ئەوەش دەبێ کە ـ ئایا ـ بۆ تەئکید بخرێتە پێش ئامرازەکانی دی . وەکو

(ئایا چەند کارکەمان دروست کردوە ؟)

(ئایا مامۆستا لەکوێیە ؟)

ـ ئایا ـ لەم دوو ڕستەیەدا کەوتە پێش (چەند ، لە کوێیە) بۆ جەخت و پێداکرتن .

• کێ بۆ کەسێکە دیلان دەڵێ :

ئاخ کێ بێ بانگ و هاوارو پەیام
بگەیەنێتە گوێ گۆڕی خەیام

• کەی ( کەنگی ، کەنگێنێ ) بۆ کاتە سالم دەڵێ

خۆزگە دەمزانی لەتاراندا ئەجامم کەی دەبێ
گۆڕی یارە مەشهەدم یا مدفنم هەر ڕەی دەبێ

• کوا ( کا ، کرانێ ، کانی ) بۆ شوێنە : گۆران دەڵێ :

کوانێ زولفی ڕەش
کولمی ئال و گەش
کوا هەیکەلی جەمال
کوا حوسنی بێ میسال

• کام ( کیهە ، کیهان ، کیژان ) بۆ هەڵبژاردنە . گۆران دەڵێ :

کام بەرزی جوانە، وەك بەرزی بالآی ؟
کام تیشك ئەکاتە تیشکی نێو نیگای ؟
کام تاسە ؟ کام مەیل ؟ کام چاوەڕوانی ؟
تەلیسماوی یە. وەك هی دڵداری ؟

• بۆ ( لۆ ، بۆچ ، بۆچی ، لەبەرچی ، قەی ) . بۆ هۆو سەبارەتە دیلان دەڵێ

ئەگینا شەراب لە مامۆستای ماف
بۆ ئەگەیشتە ئەوپەڕ لوتکەی قاف ؟

• چۆن ( کوو چلۆن ، چەوا ) بۆ بارو دۆخە ( چۆن گەیشتیتە کوردستان ؟

• چەند ( چقا ) . بۆ ئەندازەیە ، چ پێوان بێ چ کێشان بێ چ ژمارە . بێکەس دەڵێ

تۆخوا پێم بڵێ چەند جوانانت دی ؟
چەند جووتە یاری دەست لەملانت دی ؟

• چ ( چی ) بۆ شتە . بێکەس دەڵێ :

دوچاری چی بووی وا پەشۆکاری ؟
لەبەرچی پەستەو ماتەو داماوی ؟

• لە کوێ یە بۆ جێگایە . دیلان دەڵێ :

لە کوێ یە شەراب ؟ لە کوێ یە شەراب ؟
بۆ لە ئێمە بوو بە ڕێچکەی سەراب ؟

• ئەرێ : لەگەڵ کردای ڕابردوو بۆ گومان و دوودڵی یە . وەکو ( ئەرێ چووی بۆ سەیرانێ ؟ ) لەگەڵ کرداری ڕانەبردوو بۆ پرس و ڕاوەرگرتنە . وەکو « ئەرێ ئەو کتێبانە ناخوێنیتەوە ؟ »

• چما : ئەم ئامرازە بۆ ئەوە بەكاردێ كە تۆ بە جۆرێك لە شتێك كە بیستبێت، و پاشان بەجۆرێكی تر بكەوێتەوە، و گومانت هەبێ كە ئێ كەیشتنەكەت راست نەبووە . وەكو « چما ئازاد نەچوە قوتابخانە ؟ »

• ئەدی : ئەمە جۆرە پێداكرتنێكە . بۆ ئەو مەبەستەی كە دەشێ گوێگر لێ ی پەشیمان بوو بێتەوە . « ئەدی نەئخوێندەوە ؟ لێرەدا دەبێ پرسیارەكە هەر - نەفی - بێ

## مەبەستی خوازەیی :

بێجگە لە مەبەستی دروستی پرسیار كە داوای زانینی شتێكە دەشێ پرسیارەكە لەم مانا دروستەی خۆی دەربچێ، و مانایەكی خوازەیی بكەیەنێ كە لە رستەكەدا دەردەكەوێ . ئەمەش هەندێ لەو مەبەستە خوازەیی یانە:

• نكوولی بۆ نكوولی كردنە وەكو نالی دەڵێ :

شیعری خەڵكی كەی دەكاتە شیعری من بۆ نازكی ؟
كەی لە دیققەتدا پەتك دەعوا لەگەل مەودا دەكا ؟

واتە شیعری خەڵك لە نازكی‌دا ناكاتە شیعری نالی ، هەروەكو چۆن پە . لە باریكی‌دا ناكاتە تاڵ ـ داوەدەزی ـ نەفی . كۆران دەڵێ :

كام تاسە ؟ كام مەیل ؟ كام چاوەنواڕی ؟
تەلیسماوی یە ؟ وەك هی دڵداری ؟

واتە هیچ تاسەو مەیڵو چاوەنواڕی‌یەك وەك هی دڵداری تەلیسماوی نی‌یە .
بۆ چەسپاندنی مەبەستەكە نالی دەڵێ

وا زەنێ مەبە روخسارەی تۆ غائیبە قوربان
بنواڕە ، چلۆن چەسپە لە نێودیدەیی تەڕما .

( چلۆن چەسپە ) واتە زۆر باش چەسپە .

• بەردەوامی ناخۆشی‌یە . تایەر بەگ دەڵێ :

تایەکەی قوربان بناڵم من بە ئێش‌و دەردەوە ؟

دەس بە ئەژنۆ قوڕ بەسەر دایم بە رەنگی زەردەوە

واتە زۆر لە مێژە من بە دەست ئێش‌و دەردەوە دەناڵم‌و ئەم ناڵینەشم هەر بەردەوامە . دەبا بەس بێ !

• گەورەیی : سالم دەڵێ :

چوومە سەر زوانەتی مەلا بەکری عالی جەناب

چ بڵێم خەلکینە ؟ بۆم نایەتە بەر مەددی حیساب ؟

چ بڵێم ؟ واتە هەرچی بڵێم هەر کەمە . زیانەتەکە لەوە گەورەترە بە کۆتەی من باس بکرێ‌و بێتە حیساو .

• سووربوونەوە . مەلا محمدی کۆیی دەڵێ :

وا وەژێر کەوتوون بەبێ دەسەلات

رەبی ئەو تەوەمە بۆچی وای بەسەهات ؟

مەبەستی ئەوە نی‌یە هۆی بەسەرهاتەکەی بزانێ بەلکو دەیەوێ کوڵ و کەسەرو سووربوونەوەی خۆی بەم پرسیارە دەربڕێ .

• هاجیانی . وەکو « ئازاد . چۆن بوو نەهاتبووی ؟ ! »

مەبەست سەرسامی یەکەیە

• سەرکۆنەو ئامۆژکاری . حاجی دەڵێ :

بۆچی فەرموویە نبی ئەمین

أطلبوا العلم ولو بالصين ؟

واتە پێغەمبەر وای فەرمووەو ئێوەش دەبێ وا بکەن و لەو فەرموودەیە لانەدەن .

چوارەم : خۆزی ( التمنی ) . داوای هاتنە دی یا کردنی شتێکی ئازیزو

خۆشەویستە کە ڕوولەکەی لەوانە لەبن بێتە دی . ئەگەر لەوانە بێ بێتە دی یا ئەگەر بڕوای وابێ دێتەدی لە خۆزی دەشۆرێ و دەبێتە هێڤی - کە باسمان کرد - خۆزیش دوو جۆرە ؛

١ - یا ئەوەتە خۆزی بە شتێك دەخوازێ کە ڕابردووەو تازە قەناو قەت ناکەڕێتەوە وەکو بریا دوێنێ بچوومایە ماڵی مامم ) تـــازە دوێنێ ڕابردوو ناگەڕێتەوە . هەرگیز ناتوانێ لەم دوێنێیەدا بچێتە ماڵی مامت. بۆیە ئەمە دەبێتە خۆزی .

٢ - یا ئەوەتە خۆزی بە شتێکی ڕانەبردوو بخوازێ کە ئەستەم بێ بێتە دی . وەکو « وای دەنا سەفەرێکی ســـەر مانگم بکردایە ! » ئەم خۆزییە حاڵی حازر ئەستەمە بۆ تۆ بۆیە قەت نایەتە دی .

## ئامرازەکانی خۆزی :

خۆزی خواستن بە هۆی کەلێك ئامرازەوە دەبێ . ئەمانە هەندێکیانن :

• خۆزگە (١) ( خۆز یا ، خۆزی ، خازلێ ) وەکو :

خۆزگە ئەمزانی تۆ بۆ

وا خۆت ئەکەی ڕەنجەڕۆ

• بریا (٢) ( بریا بە بریایێ خوای ) . وەکو :

بریا هەر لەمدیبای . دیتم ئەمناســـیبای

• کاشکێ ( کیشـــکا ) . سالم دەڵێ :

ئەمڕۆ بۆتۆ خاڵی ئەم خەڵکە نموونەی مەحشەرە

کاشکی دەتدی لە تابوتا جەمیعی مەزدومان

---

(١) کورد دەڵێ : داری خۆزگەی بێ بەرە

(٢) کورد دەڵێ : ( بریـا ) یان چاند شین نەبوو

پێنجەم بانگ (النداء) . ئەوەیە کە ئەگەر بانگی کەسێک بکات، وا
داوای لێ بکات هۆشیار بێتەوەو بچێتە لای. وەکو « هۆ مام حەتیلر وە
نەختێ لام دانیشە ». ئەمەش مانای دروستی بانگە. خۆ ئەگەر بانگە
بۆ ئەو مانا دروستەیە نەبێ بەڵکو بۆ مەبەستی تر بێ کە لە رستەکە
دەردەکەوێ ئەو حەلە دەبێتە مەبەستی خوازەیی... لەمەولا نەختێ باس
دەکەین لە کوردیدا بانگ کردن بە دوو جۆر دەبێ :

١ ـ بەبێ ئامراز . وەکو هێمن دەڵێ

وەرە مەیگێڕ ئەوشۆ خەمی دڵ کەم کەم
لووزەوم بەردە سەری نامەوێ جورعەیێ کەم کەم !

لەم جۆرە بانگەدا تەنیا بە گۆڕانی پەردەو ئاوازی دەنگەوە بانگە
دەردەکەوێ .

٢ ـ بە ئامراز ئەمەش وا دەبێ کە ئامرازێك بۆ بانگ‌کردنەکە
کاربێنێ وەکو سەلام دەڵێ :

ئەی دڵەکەم بۆچی داماوی ؟
بۆچی وا کەوەو شین هەڵگەڕاوی ؟

ئەو ئامرازانەش دەکرێنە دوو جۆر ، بە پێی شوێنیان لە رستەوە .

أ ـ ئەو ئامرازانەی لە پێش بانگکراوەوە دێن . ئەمانەش هەندێکیان :

• ئەی بێکەس دەڵێ

ئەی وەتەن مەفتوونی تۆمو شێوەتم بیرکەوتەوە
وەختێ ئازادی‌و ئەسارەت پێ بە بەندو کۆتەوە

• هۆ : دلدار دەڵێ

سەلامو مەلیك ، هۆ کاکەی ئاودێر
مەلیکە سەلام پیادەی تەنیا

هۆ هۆ . ( ئەمە بۆ دوورە ) . (هۆ هۆ مام هۆمەر ! )
٢ ـ ئەو ئامرازانەی دەبنە پاشگری بانگکراوەکە . ئەمانەش هەندێکیانن
( ا ) بەزۆری بۆ ناوی تاکی نێرینە بە کار دێ وەکوو زێوەر دەڵێ

مامە هۆمەر سەد شوکر تۆ قوەت و جاهت هەیە
هەر لە دێیەک چەند ڕەزو هەردو بەراویشت هەیە

بێکەس دەڵێ :

کوردە تاکەی بێخەبەر بی نوستنت بێ عاری یە

( ێ ) . بۆ ناوی تاکی مێینە بە کاردێ وەکو
کچێ هەستە بچۆ قوتابخانە

یا وەکوو : ( پوورێ ، ژنێ ، حورمێ ، کەورێ )
( ینە ) لە گەڵ ناوی کۆ بەکاردێ وەکوو زۆربەی هەرە زۆری حەیرانەی کوردی بەم شێوە دەست پێ دەکات « برایینە ، برادەرینە ! » سەرنج جاری وا دەبێ بۆ جەخت و تەئکید دوو ئامرازی بانگ پێکەوە دێن یا یەکێ لە وانەی لەپێش بانگکراوەکە دێن و یەکێ لە وانەی دەبنە پاشگر وەکو زێوەر دەڵێ :

ئەی کوردینە ئەبی هەردینە
یا دەس لە ناو دەست کەین هەموو

## هەڵبەستی خوازەیی

. گوتمان هەڵبەستی دروست لە بانگ کردن ئەوەیە یەکێ داوای هوشیار بوونەوەو هاتنی گوێگر بکات بۆ لای بەڵام زۆر

---

زۆر جاری وا هەیە ئەم « ە »یە درێژ دەبێتەوەو دەبێتە « ا »
وەکوو « بێکەسا » « نیما » « سالما »

جار وادەبێ که بانگێ لەم مانا دروسته دەشۆرێو ماناو مەبەستێکی دەکەیەنێ ، یا قسەکەر مەبەستی پێ مانایەکی ترە کە لەرستەکەدا دەر ئەویش دەکوترێ بانگی خوازەیی

ئەمەش هەندێ لەو مەبەسته خوازەییانەی بانگ :

• دل لێسەندن : وەکو کوربنە دستی خۆتان بوەشێنن ! »

• هاندان وەکو بێکەس دەلێ

سەدەی بیستەمە کوردە غیرەتێ له خەو راپەرە مەولی هیمە

• شین . وەکو سەلام دەلێ

کولیلو شینه ئیمم بەنازرە رۆله رز رۆله

دەستێ ئەژنۆ بروم بووم یەکزنەرە لەم دەشتە چۆله .

• داخو خەفەت . کاکەی فەلاح دەلێ

ئەی دل وەکو من بناله

بگری بۆ ئەو چوار مناله

• سەرکۆنه مەلای جزیری دەلێ :

ئەی کوردی ئەفاسی خانه ویران

رەی عەبدی زەلیل شێخو پیران

• وه بیرهێنانەوە کامران دەلێ

دایه تۆ منت بۆ پەروەردە کرد

بۆ خۆشی خۆت بوو یا بۆ کەلی لورد .

## پوختەی بەشی یەکەم چەند سەرنجێك :

پوختەی ئەم بەشە ئەوەیە که هەر نووسەرێك شێوازی تایبەتی هەیە لە نووسیندا ، وه هەموو شێوازێکیش یا دەکەوێتە قالبی خه

به دلڕشتن دەردەبڕێ . خەبەر ئەوەیە ڕاستو درۆ هەڵبگرێ . داڕشتن ئەوەیە ڕاست و درۆ هەڵنەگرێ . داڕشتن دووجۆرە : داخوازی و ینلە داخوازی . داخوازی یەکە پێنج بەش دەکرێتەوە « فەرمان ، ئەهێشتن ، پرسیار ، خۆزی ، بانگ » . هەریەکە لەمانەش مانایەکی دروستو چەند مانایەکی خوازەیی هەیە کە لە ڕستەکەدا دەردەکەوێ

## پەیوەندی خەبەرو داڕشتن :

زۆر جار وادەبێ هەریەکە لە خەبەرو داڕشتن لە مانای دروستی خۆیان دەردەچن و لە باتی یەکتر بەکاردێنو مەبەستی یەکتر دەگەیەنن . واتە جاری وا هەیە خەبەرێك مانایەکی داڕشتنی تێدایە و جاری واش هەیە داڕشتنێك خەبەرێك دەگەیەنێ .

• جاری وا هەیە ڕستەیەك خەبەرەو داڕشتن دەگەیەنێ وەکو ( مادام دەخوێنی سەرکەوی ! ) واتە « بخوێنە تا سەردەکەوی . » جاری وا هەیە داڕشتنەکە فەرمانێکی تێدا بێو فەرمانەکە زۆر توند بێو بخرێتە قالبی خەبەرەوە . وەکو ئاغایەك بە کرمانجێك بڵێ « بەیانی دەچیتە بازاڕ » واتە دەبێ بچیت .

• یا وا دەبێ خەبەرەکە فەرمانێکی تێدا بێ بەرابەر بە کابرایەکی گەورەو ئەکەر بۆ ڕیزو ئیحترام خۆی لە شێوەی فەرمان ـ داڕشتن - دور بخاتەوەو بیخاتە قالبی خەبەرەوە . وەکو :

( جەنابت کتێبەکەت نەدی ) لەباتی ( کتێبەکە بێنە ! ) یا وادەبێ ئەکەر مەبەستی هوشیار کردنەوەی گوێگر بێو خۆی لە داڕشتن دور بخاتەوەو بە خەبەرێك هوشیاری بکاتەوە . ئەمەش نەزاکەتی تێدایە . وەکو مامۆستا بە قوتابییەکانی بڵێ

(قوتابی ژیر ئەمتەرخەمی ناكات) نەبانی ز ئەمتەرخەمی منكە

• هەندێ جار وادەبێ خەبەر دەكەوێتە قالبی دارشتنەوە .

وەكو ( بخوێنە وەختیەتی ! ) واتە ئەم كاتە كاتی خوێندنە ! )

• بەم جۆرە خەبەرو دارشتن زۆر جار لــە جێگەی یەكترو كەیاندنەبەستی یەكتر بەكاردێن

بەشی شەشەم

# شیکردنەوەی رستە

لە زمانی کوردیدا هەر رستەیەکی دەیگری لە کۆمەڵە وشەیەک پێک دێت . لە بکەرو کرداری تەواوکەرو ئامراز پێک دێت. جا لێرەدا ئێمە وەکو رێزمانووسێک لە شی کردنەوەی رستە نادوێین ، بەڵکو لەم سووچەوە باسی دەکەین کە پەیوەندی بە رەوانبێژی رستەکەوە هەیە .

بۆ ئەمەش ئێمە چەند باسێکمان دێتە پێش کە بە پێی دەرفەتو توانا لێیان دەدوێین . ئەمەش هەندێک لەو باسانەی کە بە پێویستی دەزانین لێیان بدوێین . ( ناوهێنان ـ جا هی بکەر بێ یا کردار ـ لابردن ـ جا لابردنی بکەر بێ یا کردار ـ پاشوپێش کردن ، تایبەتی . . )

## یەکەم : ناوهێنان

**ناوهێنانی بکەر** زۆر جاری وا هەیە رستەیەک پێویستی بە ناوبردنی بکەر نییە بەڵام قسەکەر لەگەڵ ئەمەشدا ناوی هەردێنێ . ئەم ناوهێنانە خزمەتی مەبەستێکی قسەکەر دەکات کە دەیەوێ بیهێنێتە دی . ئەمەش هەندێ لەو مەبەستانە

• بۆ جەخت کردن لەسەر بکەرەکە وەکو

( هەر ئەو بوو هات . هەر ئەو بوو ئیشەکەی رایی کرد ، هەر ئەو بوو ئێمەی لە تەنگانەدا رزگار کرد .

بێکەس دەڵێ     ئز چبت من کوردم     نەتەوەی کوردم

• بۆ درێژەدان بە قسەکە تا گوێگر گوێ رابێڵێ . جا ئەمەش چ لەبەر

بابەبەرزەی گوێگر بێ ، چ لەبارەی خۆشەویستی

پ / ئەمە چی‌یە بە دەستەوە ؟ و / ئەمە کتێبە .

لە وەڵامدا ئەوەندە بەس بوو کە بڵێی (کتێبە) بەڵام کە ناوی بکارت هێناو گوتت ( ئەمە .. ) بۆ ئەوەتە درێژە بە قسەکە بدەی . بۆی هەیە زیاتریش درێژە بە قسەکە بدەی و قسەی تری بە دەمەوە بکەی ، بۆ ئەوەی قسەکەر پرسیاری ئەو شتانەی لێ کردبێ ، یا بە تەمابێ تۆ شتێ وای بۆ روون بکەیتەوە . وەکو لە وەڵامی پرسیارەکەی پێشوودا بڵێی « ئەمە کتێبە کە بێ ئێش بووم دەیخوێنمەوە . »

• بۆ پیشاندانی گەورەیی بکەر . وەکو

پ / ئەرێ ئازاد هاتەوە ؟

و / بەڵێ ، ئەو بلیمەتە هاتەوە .

لە راستی‌دا ئەوەندە بەس بوو بڵێی « بەڵێ . یا « بەڵێ ، هاتەوە » بەڵام کە گوتت « بەڵێ ئەو بلیمەتە هاتەوە » تۆ بۆ پێ هەڵگوتنی ئازاد راناوەکەت هێنا ( ئەو ) وەسفەتێکی باشیشت دایە پاڵ ، بێ ئەوەی لە پرسیارەکە داوای روون کردنەوەی ئەم لایەنەت لێ کرابێ ، تا لە خوێنەرە وادەکەی . کەوا دەکەی بۆ ئەوەتە بلیمەتی و گەورەیی ئازا بە گوێگر بگەیەنی .

• بۆ پیشاندانی سووکی بکەر ، ئەوەش هەر وەکو ئەوەی پێشوو وایە بەڵام لە باتی سیفەتێکی بەرزو باش ، سیفەتێکی بەدو خراپ دەداتە پاڵ بکەری ناو هاتوو . وەکو

پ / ئەرێ رەمو یان دایە دادگا ؟

و / بەڵێ رەمزی کەتنکەریان دایە دادگا .

جگە لەوەی کە ئەوەندە بەس بوو بڵێ ( بەڵێ ) . یا ( بەڵێ دای

دادگا ) . ناوی ڕەمزی هێناو سیفەتێکی بەدیهی دایە پاڵ کە کەتنکردنە ..
دەتوانن لەوەش زیاتر بڕوا بە دەمیەوەو حوکمەکەشی باس بکا و .. بیست
سالیان هاوپشتە ژووری ) ئەم زیادە ڕۆیشتنەش بۆ ئەوەیە کە ئەنجامی
کەتنەکەی دەربخا
• بۆ سەرسامی ئەگەر کارو کردەوەیەکی وا درابێتە پاڵ بکەر کە
جێگەی سەرسامی بێ وەکو
پ / ئایا ڕاستە ئازاد شێرێکی کوشتوە ؟
و / بەلێ ڕاستە ئازاد کوشتوویە
یا / بەلێ ئازاد خۆی کوشتویە
• بۆ ئەوەی قسەکەرماوەی پاشەکشەی لەبەردەمدا بمێنێتەوە . ئەوەش بە
تایبەتی لە دادگاو تۆمارگاو شایەدو گەواهیو باسی یاساییدا دەبێ
وەکو ئەوەی کە دادوەر لە شایەتی پرسی
تۆ دیت چەتۆ هەلۆی کوشت ؟
دەبێ بڵێ « بەڵێ دیم چەتۆ هەلۆی کوشت . »
واتە دەبێ ناوی ( چەتۆ ) بێنێ و تۆمار بکرێ . ئەگەر شایەدەکە ناوی
نەمێنێ و هەر بەوەندە وازبێنێ بلێ کوشتی . ( یا بەلێ هەلۆی کوشت . )
پاشان دەتوانێ پاشگەز بێیەوەو بلێ مەبەستم چەتۆ نەبووە ، سەگ بووە ..
بەلام کە ناوەکەی هێنا ئیدی دەرفەتی پەشیمان بوونەوەو پاشگەزبوونەوەی
نامێنێ

## ناوهێنانی کردار :

مەبەست لە کردار ، هەر تەنیا کردار نیە بەلکو کردارو پێوەندەکانی
کرداره . کە لە فارسی گوزارەی پێدەلێن .. کرداریش وەکو بکەر ،

زۆر جار وادەبێ کە ڕستەکە پێویستی بە ناوهێنانی نییە بەڵام لەگ ئەمەشدا قسەکەر ناوی هەر دێنێ. کە ناوبەش دێنێ مەبەستێکی پێیە ئەمەش هەندێ لەو مەبەستانە.

• بۆ پێشاندانی کەمزانی گوێگر وەکو:

پ / کێ بەڕێوەبەری گۆڤاری کەلاوێژ بوو؟

و / سەجادی بەڕێوەبەری کەلاوێژ بوو.

لە ڕاستیدا ئەوەندە بەس بوو بڵێ - سەجادی - بەڵام کە کردا دووپات کردەوەو ناوی هێنا. بۆ ئەوەی بوو کەمزانی گوێگر پیشان بدا جاری وا هەیە لە کاتی وەڵام دانەوەدا بۆ سووکی و ڕیزکردنێک بە پرسیارەکەرەکەدا لە پاش وەڵام دانەوەی تاواوی پرسیارەکەو هێنانی کردار، هەمان پرسیار دووپات دەکاتەوە، وەك ئەوەی بە چاوانەکەی دابداتەوە وایە دەڵێ

• سەجادی بەڕێوەبەری کەلاوێژ بوو کێ بەڕێوەبەری کەلاوێژ بوو

• ئەوەك گوێگر بە تەواوەتی لە مەبەستی قسەکەر ناگات.

## دووەم : لابردن

زۆر جار وادەبێ کە لە کاتی نووسین و ئاخاوتندا جێگایەك پێویستە بە ناوبردنی بکەر یا کردار یا تەواوکەر بێ بەڵام نووسەر بە ئەنقەست لای دەباو ناوی ناهێنێ. چونکە ماناکە لە ڕستەکەوە دیارەو ناوبردنی زیادە دەزانێ واتە بەهۆی ئەو ووشانەی کە ..وکورترین مانای ووشە نەبێژراوەکانیش دەردەکەوێ و ئیتر پێویست بە گوتنی ئەوان ناکات لێرەدا مەرجە بێ ناوبردنی .ئەو ووشانەش کە لادەبرێن ماناکە هەر دەربکەوێ ئەگەر دەرنەکەوێ دەبێتە مەبەل مەتەل.

## لابردنی بکەر: کەبکەر لە رستەدا دەبڕێ ، بۆ مەبەستی تایبەتییە.

ئەمەش هەندێ لەو مەبەستانە

• بۆ ئەوەی بکەر لە تامو بۆ نەکەوێ ، چونکە هەندێ شت هەیە ناوی زۆر بێ خێری نامێنێ وەکو ( ئەوەی چاکە بکا دێتەوە ڕێی ) دەبوا بڵێ ئەوەی چاکە بکا ـ چاکەکە ـ دێتەوە ڕێی . ) بەڵام بکەرەکەی لابرد کە ووشەی ( چاکەکە ) یە بۆ ئەوەی تامی نەبڕێ

• ئەگەر دەرفەتەکە تەنگ بێ و ماوەی درێژەپێدان نەبێ یا قسەکەر خۆی حەز نەکا درێژەی پێ بداتو بیەوێ لە کورتی بیبڕێتەوە وەکو
باوکت چۆنە ؟ باشـــە
لـە جیاتی ( باوکـم باشە ) . کە بکەرەکەی فڕێ دا بۆ ئەوەی بوو زوو بیبڕێنێتەوە

• ئەگەر دەرفەتە کە زۆر تەنگ بێو قســـەکەر بترســێ ئەوەك ئەو دەرفەتە کەمەی کە هەیـە لـە دەسـت بچێ وەکو ئەوەی برادەرێکت نووستبێ یا دانیشتبێ یا وەستا بێو زەینی ڕۆیشتبێو ئاگای لـە خۆی نـەبێ . لەولاوەش مارێك بـە تیژی بۆی بچێ . تۆ کە چاوت بەم دیمەنە کەوت دەزانی دەرفەتەکەزۆر تەنگەو زۆری نـەمـاوە مارەکە بگاتـە برادەرەکەت ئیدی هەر ئەوەندەت پێ دەمێنێ هاوار بکەی ( مارە ! ) بۆ ئەوەی برادەرەکەت هوشـیار بێتەوەو دەسـتو بردێك بکـاتو خۆی ڕزگار بکات بـەڵام ئەگەر تۆ ناوی بکـەر بێنیو بدەی بـە دەمیەوە باسی بکەی دەرفەتی هۆشیار بوونەوەی برادەرەکەت نامێنێ .

• هەندێ جاری وا هەیە کە قـسەکەر بە ئەنقەس ناوی بکەر ناهێنێ بۆ ئەوەی هەر کاتێ ویستی یا ناچار بوو ، بتوانێ پاشگەز بێتەوە ئەگەر بتەوێ جوێن بە کابرایەك بدەیو بڵێی ( خواریە ! ) لێرەدا تۆ نـاوی

کابرات نەدینا بزیەش نارت ئەمێنا تا هەر کانێ تەنگاو بووی یا نرسەت کەیفتێ بتوانێ حاشای لێبکەی‌و بڵێی من لەگەل فلانم نەبوە لـــە گەل فسارم دابووە .

• ئەگەر مزگێنی‌یەکت لابێ‌و پتەوێ بە زووترین کات ئـــەم مزگێنی‌یە بکەیەنیت . وەکو ئەوەی کە منداڵێك ناجح دەبێ هەرا دەکات بۆ ماڵەوەو دەڵێ ناجح ، ناجح )

## لابردنی کردار :

کردار بۆ کەلێ مەبەست لادەبرێ‌و ناوی ناهێنرێ

ئەمەش هەندێ لەو مەبەستانە

• کە گوتنەکەی زیاد بێ‌و نەگوتنی نەبێتە هۆی شێوانی ماناکە .

پ ـ چەند کەس هاتن ؟

و ـ دوو یـا دوو کەس

• بۆ جەختو بەهێزکردنی ماناکە گۆران دەڵێ

فەرمانێ فەرمانێ

ئەی گزەل بۆ دەردی بێچارێ

چـارەیەك دەرمانێ

واتە فەرمانێ بدۆزنەوە چـارەیەك بکـــەن دەرمانێ ئامادەکەن

کردارەکان لە شیعرەکەدا فڕێ دراون . ئەم فڕێ دانە ماناکەی بەهێز کردووە بێ‌کەس دەڵێ :

سەدەی بیستەمە کوردە هیمەتێ

لە خەو راپەڕە هەوڵێ هیمەتێ .

بەسیە تەزانین ، عیلمیّ ، سەنعەتیّ
سووکی هەتا کەی ناویّ حورمەتیّ ،
کە ماناکە بە تەئل و لیکدانەوە دەرك بکریّ و پێویست بە ووشەو ناوبردن نەکا ، وەکو
پ - کێت هەیە ؟
و - تـز ،
واتە تۆم هەیە . بەلاّم کە کوتی تۆ ، تیّ دەگەین مەبەستی چیە و پێویست بە ناوبردنەکە نامێنێ
• ئەگەر بێت و ناوبردنی دووپات بوولەوە بێ . جا بۆ ئەوەی تەگەر خۆی لەم دووپاتکردنەوەیە رزگار بکات جارێك ناوی دێنێ و جاری دووەم ناوی نابا . وەکو
منیش چووم و براشم
واتە منیش چووم و براشم چوو
چونەکە جارێك بۆ - من - • و جارێك بۆ - برام - ، بۆیە هەر تەنیا جارێك ناوی چوونەکەی هێناو هەر دوو بکەرەکەی گێراوەوە سەر ئەو کردارە ، یا ئەو کردارەی دا بە هەردووکیان نالی دەڵێ
ئەو چاوە غەزالە فەتەراتی سەرو ماڵە
ئەو نێرگزە کاڵە ئەمنی هێخست و لەکالاّ

## سێیەم : پاش و پێش کردن

لە زمانی کوردیدا رستە لە چەند بنەرەتێك پێك دێ و هەر یەکێکیش لەمانە لە دارشتنی رستەی کوردیدا جێگای تایبەتی خۆی هەیە بەلاّم هەندیّ جاری وا هەیە کە ئەو وشانە لە جێگای خۆیان دەجولێن و

دەخرێتە شوێنی ترەوە ، جا جولانەکە یا بەرەو پێشە یا بەرەو پاش وانە ئەو بنەڕەتەی کە لەسای ئێوە دەکرێ یا لە شوێنی خۆی بەر پێشەوە هەڵدەگیزرێ یا بەرەو دواوە . بەڵام ئێمە لێرەدا زیاتر مەبەست پێشکەوتنە ... رەگەزو بنچینەکانی رستە ، چ بکەر بێ چ کردار بۆ چ تەوارکەر کە پێش دەخرێ بە مەبەستێك پێش دەخرێ . ئەمە هەندێ لەو مەبەستانە :

• دەشێ ئەوەی پێش دەخرێ خۆشی و مزگێنی یەکی تێدا بێ . وە پیرەمێرد دەڵێ

هاتن شەهیدەکان بە جلو بەرگی خوێنەوە
دایکی وەتەن دەمەلـە سلاّویان بسێنەوە

لە رستەی یەکەمدا دەبوا بڵێ « شەهیدەکان هاتن » بەڵام لەبەر ئەو هاتنی شەهیدان خۆشی و مزگێنی و گەورەیی تێدایە بایەخی خستۆتە ، ووشەی ( هاتن ) ی پێش شەهیدەکانی خستووە

• دەشێ ناخۆشی یەك هەبێ . بۆ ئەمەش لەو رەگەزەی ناخۆشی دەکەیەنێ پێش دەخرێ تا بە زووترین کات بیگەیەنێ . سەلام دەڵێ

هاوار ئەکا دایکی وەتەن
وا گیان ئەدا پیاپا بگەن

دەبوا بڵێ (دایکی وەتەن هاوار ئەکا) بەڵام لەبەر ئەوەی هاوارکردن ناخۆشی و پەژارەو فریادی تێدایە ، پێشی خستووەو تا گوێگر بەزووترین کات لەو ناخۆشی یە بکات کە ئەمە هەیە ، لەوەش هەیە قافیەش لێرەدا دەوری خۆی لە پاش و پێش خستنەکەدا دیوە .

• بۆ تایبەتی . ئەگەر بێتەو پێش خستنەکە پەیوەندی یەکی تایبەتی لە دوو شت بچەسپێنێ وەکو هێمن دەڵێ

گەرچی تووشی ڕەنجەڕۆیی و حەسرەت و دەردم ئەمن
لەت لە دەست ئەم چەرخە سپلە نابەزم مەردم ئەمن

لە نیوەی یەکەمدا دەبوا بڵێ ( گەرچی ئەمن تووشی ... ) بەڵام ئەو تووشبووبەکەی پێش خستووەو - ئەمن - ی دواخستووە ، چونکە گرنگی لەم ڕستەیەدا پێشان دانی تووش بوونی ئەوە بە ڕەنجەڕۆیی و حەسرەت و دەرد ، لە نیوەی دووەمیشدا دەبوا بڵێ « ئەمن مەردم » بەڵام ئـــەو مەردەکەی پێش خستووەو بەم پێشخستنەش مەردایەتی‌یەکەی تایبەتی کردووە بە خۆیەوە . واتە مەردم ئەمن نەك هیچ شتی تر

# چوارەم : تایبەتی ( القصر )

( تایبەتی ) وەك زاراوەیەكی رەوانبێژی بەوە دەوترێ كە شت ( سیفەتێك ) تایبەتی بكەی لەكەسێ یا شتێ و ئەو لەسەر هەر تۆ خۆی ئەو پەیوەندی‌یەی لەگەل شتە تایبەتی‌یەكەدا هەبێ ... وەكو ( گۆر لەبێ كەس شاعیر نی‌یە ) ئێرەدا سیفەتی شاعیرێتی تایبەتی كراوە بە گۆران . دوای گۆران شاعیرێتی بۆ كەس نەماوەتەوە . هەر گۆران شاعیرەو برایەوە . لەم نموونەیەدا ئەم شتانەمان بۆ دەردەكەوێ :

١ ـ لێرەدا باسێك هەیە كە تایبەتی كردنی شاعیرێتی‌یە بەگۆران . ئ باسە لە رەوانبێژی‌دا پێی دەگوترێ ( تایبەتی ) .

٢ ـ لەم باسەدا شتێ هەیە كە شاعیرێتی‌یەو تایبەتی كراوە بە كەسێكە شتەكە شاعیرێتی‌یە ـ پێی دەگوترێ ( تایبەت ـ المقصور ) .

٣ ـ ئەو كەسەش كە شاعیرێتی‌یەكە هەر بۆ ئەوە و لێرەدا گۆرانە پێ دەگوترێ ( تایبەتدار ـ المقصور علیه ) .

٤ ـ ( تایبەت ) و تایبەتدار ) لە زانستی رەوانبێژی‌دا پێیان دەگوترێ ( دوولای تایبەتی ـ طرفا القصر )

## دابەش كردنی تایبەتی

جۆرەكانی تایبەتی ( بەگوێرەی دروستەو دانەپال )

تایبەتی دوو جۆرە . دروستەو نا دروست . یا لەباتی نادروستەكە دانە بەكاردێ . تۆ كە شتێك تایبەتی دەكەی بە شتێكی ترەوە . لەم تایبە كردنە یا لەراستەقینەو واقیعدا دروستەو شتی تر هەلناكرێ ، یا بەه دانەپال ـ اضافە ـ دروست‌كراوەو شتی تریش هەلدەكرێ . جۆری‌یەكە

تایبەتی دروستە ـ آصر الحقیقە ـ جۆری دووەم تایبەتی دانەپالــە ـ آصر اضافة ـ

١ ـ تایبەتی دروست : ئەوەیە کە ئەو پەیوەندییەی لە نێوان (تایبەتی) و ( تایبەتدار ) دوە هەیە شتێکی راست و دروست بێ و لەو بەدەر هیچ شتێکی هەڵنەگرێ و بە هیچ جۆرێ‌تر لێك نەدرێتەوە . وەکو ( تەنیا مانگی شوبات بیست‌وهەشت یا بیست‌ونۆ رۆژە ) .

پێوەندی نێوان ( مانگی شوبات ) و ( بیست‌و هەشت یا بیست‌ونۆرۆژ) پەیوەندییەکی دروستە . چونکە لە راستی‌و والیعیشدا هەر وایە‌و هیچ مانگی‌تر نەبووەو نابێ کە ( بیست‌وهەشت یا بیست‌و نۆ ) رۆژ بێ . ئەوانەی تر یا سی یاسی‌ویەك رۆژن یا وەکو ؛

((تەنیا روباری دیجلە بە ناو بەغدادا دەڕوا ))

لێرەدا روبارێك هەیە و ناوی دجلە، ئەم روبارە تایبەتی‌یە بەشارێك کە بەغدایە ئەمە پەیوەندییەکی دروستە، واتە تایبەتی دروستە - چونکە بێجگە لە دیجلە هیچ روباری تر نی‌یە بەناو شاری بەغدادا بێ‌بپەڕێ

٢ــ تایبەتی دانەپال : ئەم جۆرە تایبەتی‌یە ئەوەیە کە شتێك تایبەتی بێ بە شتێکی ترو ئەو پەیوەندییە بشێ بۆ شتی تریش تێبپەڕێ ، وەکوو :

( هەر ئازاد زیرەکە ) لێرەدا زیرەکی هەیەو ئازاد هەیە زیرەکی تایبەتی کراوە بە ئازاد ئەکەر بێینە سەر والیع و راستی دەبینین خەلکی تریش‌هەن زیرەکن بەلام ئەوەندە هەیە کە تۆ زیرەکی تایبەتی دەکەی بەئازاد مەبەستت ئەوەیە لەچاو یەکێکی تر یا چەند کەسێکی ترەوە تایبەتی بکەی بەو ، ئەگەنا بە شێوەیەکی گشتی وەری بگری خەلکی تریش هەن وەکو : ئازاد ،زیرەکن‌و رەنگە لەویش زیرەکتر بن .

یا وەکو ، ( شێرزاد هەر شیعر دەنووسێ ) . مەبەست ئەوەیە کە بەخەمان

( جا هەرچی بێ ) نانوسێ ... لەك هیچ کارو کاسبی ناکا خەیری نووسینە

وانە بۆ شتی تر تێدەپەڕێ وەکو خواردن ، خواردنەوە ، یاری کردن

خوێندنەوە . بەلام بۆ یەك شت تێناپەڕێ کە ئەویش پەخشان نووسینە

## جۆرەکانی تایبەتی ( بە گوێرەی هەردوولا )

تایبەتی : چ تایبەتی دروست بێ و چ تایبەتی دانەپال ، لە رووی سیفەت

مەوسوفەوە دوو جۆرە . یا سیفەت تایبەتی دەبێ بە مەوسوف

مەوسوف تایبەتی دەبێ بە سیفەت . ( مەبەست لە سیفەت و مەوسوف

ئەوە نییە کە لە زانستی ریزماندا هەیە .

١ ـ ئەوەیە سیفەت تایبەتی بێ بە مەوسوف وەکو :

( هەر من ناشادم ) لێرەدا سیفەتی ناشادی تایبەتییە بە : من

سیفەتیش کە تایبەتی دەبێ بە مەوسوف . ئەم تایبەتی بوونە یا بەدروست

دەبێ ، یا بە دانەپال .

ا ـ بە دروستی . وەکو : ( ئەوەی بالدار نەبێ نافڕێ ) لێرەدا سیفە

فڕینی تایبەتی کردووە بە بالدار . غەیری بالدار نافڕێ .. واتە فڕینە

بۆ غەیری بالدار تێناپەڕێ . ئەمەش تایبەتی دروستە .

ب ـ بە دانەپال وەکو : ( هەر کوران شاعیرە ) . سیفەتی شاعیر

تایبەتییە بە کوڕان . ئەم تایبەتی دانەپالە چونکە بێجگە لە کوڕان

خەلکی تر هەن کە شاعیرن . بەلام شاعیریتی کوڕان ـ بەرای قسەکەر

بەسەر ئەواندا زالە .

٢ ـ ئەوەیە کە مەوسوف تایبەتی بێ بە سیفەت ... وەکو ( ئازاد تەنها

خوێندەوارە ) . لێرەدا مەوسوف ـ ئازاد ـ تایبەتی کراوە بە سیفەتی

خوێندەواری ـ .. لێرەشدا دیسان کە مەوسوف تایبەتی دەکرێ بە

سیفەت ئەم تایبەتی‌کردنە یا بە دروستی دەبێ یا بە دانەپاڵ .

ا ـ بە دروستی . وەکو : ( ئادەمیزاد تەنیا لە سەر زەوی دەژی . )

لێرەدا مەوسووف ـ ئادەمیزاد ـ تایبەتی کراوە بە سیفەتێك ـ ژیانی سەر زەوی ـ .. ئەمەش تایبەتی‌یەکی دروستە ، چونکە تێ ناپەڕی بۆ ژیانی سەر مانگ یا مەریخ یا ڕۆژ .

ب ـ بە دانەپاڵ . وەکو « شێرزاد تەنیا دختۆرە » لێرەدا مەوسووف ـ شێرزاد ـ تایبەتی کراوە بە سیفەتی دختۆری لەم پەیوەندی‌یەش دانەپاڵە چونکە دەشێ بۆ سیفەتی تریش تێ‌پەڕێ بۆ زیرەکی ، ئازایی ، دلێری

**جۆرەکانی تایبەتی :** ( تەنیا تایبەتی دانەپاڵ بە گوێرەی باری گوێگرەوە ) بە گوێرەی باری لێکدانەوەو بۆچوونی گوێگر تایبەتی دانەپاڵ دەکرێتە چەند جۆرێك . بۆیەش کرتمان تایبەتی دانەپاڵ و بەس چونکە تایبەتی دروست لە پەیوەندی‌یە دروستەکە خۆی کە واقیعێکی ڕاستەقینەی هەیە هیچی تر هەڵناگرێ‌و بە هیچ جەشنی تر لێك نادرێتەوە بەڵام تایبەتی دانەپاڵ لەبەر ئەوەی بۆ شتی دیش دەپەڕێتەوە ، لێکدانەوەی تریش هەڵدەگرێ . جا بە پێی لێکدانەوەی گوێگر تایبەتی دانەپاڵ دەکرێتە سێ جۆر .

١ ـ تایبەتی تاقانە : ئەمە ئەگەر گوێگر بڕوای وابێ کە ئەو پەیوەندی‌یەی لە نێوان ( تایبەت ) و ( تایبەتدار ) دا هەیە ، هەم ( تایبەتدار ) یش دەگرێتەوەو هەم شتی تریش ، واتە بێجگە لە ( تایبەتدار ) شتی تریش هەن کە پەیوەندی‌یەکەیان بەسەردا بکەن ..

٢ ـ تایبەتی ئاوەژوو : ئەگەر بڕوای گوێگر پێچەوانەی ئەو پەیوەندی‌یە

بێ کە لە نێوان (: تایبەت ) و ( تایبەتدار ) ەوە هەیە ،

٣ ـ تایبەتی کاڵ : ئەمە ئەگەر گوێگر لە بارەی هەبوون و لەبوونی پەیوەندی نێوان ( تایبەت و ( تایبەتدار ) ەوە دوودڵ بێ نەبەتەواو بڕوای پێ هەبێ ، نە بە تەواویش ڕەتی بکاتەوەو بڕوای بە پێچەوانەی بێ

ئێستاش ئەم سێ جۆرەی تایبەتی بە دوو نموونەی جیاواز ڕوون دەکەینەوە

نموونەی یەکەم : ئەگەر سیفەت تایبەتی بێ بە مەوسووف وەکو : « تەنها خانی شاعیرە » لێرەدا سیفەتی شاعیرێتی تایبەتی کراوە بە مەوسووفێکەوە کە خانییە . جا لێرەدا ئەگەر گوێگر لەگەڵ بیستنی ئەمەیەدا بڕوای وا بوو کە ڕاستە خانی شاعیرە ، بەڵام شاعیری تریش هەن وەکو مەولەوی و نالی و گۆران واتە سیفەتەکە بۆ مەوسووفی تریش تێدەپەڕێ ئەو دەبێتە تایبەتی تاکانە .

خۆ ئەگەر گوێگر لەو بڕوایەدا بێ کە خانی هەر شاعیر نییە بەڵکو یەکێکی وەکو مەولەوی یا نالی یا گۆران شاعیرە ئەوا دەبێتە تایبەتی پاوەژوو .

بەڵام ئەگەر گوێگر دوودڵ بێ لەوە ئاخۆ تەنیا خانی شاعیرە یا نە مەولەوی یا نالی یا گۆران ، ئەوا دەبێتە تایبەتی کاڵ

نموونەی دووەم : ئەگەر مەوسووف تایبەتی بێ بە سیفەت . وەکو « دلێر هەر دەخوێنێتەوە » لێرەدا مەوسووفێک هەیە کە دلێرە تایبەت کراوە بە سیفەتێکەوە کە خوێندنەوەیە . ئەگەر گوێگر بڕوای وابێ ڕاستە دلێر هەر دەخوێنێتەوە بەڵام لەم تایبەتییە بۆ شتی تریش تێدەپەڕ وەکو خەوتن ، پیاسە کردن ، لە بەیاری کردن تایبەتی تاکانەیە . خۆ ئەگەر بڕوا وابێ کە دلێر هەر دەنووسێتەوە نەک دەخوێنێتەوە ، واتە ئەگەر بڕوا ئەو پێچەوانەی پێوەندییەکە بێ ، ئەوا دەبێتە تایبەتی پاوەژوو . بە

ئەگەر دوودڵ بێ لەوەدا داخۆ دڵنیر هەر دەخوێنێتەوە یا هەر دەنووسێتەوە، ئەو کاتە دەبێتە تایبەتی تاڵ .

## ( تایبەتی )
## لە زمانی کوردیدا

بێگومان هەر زمانێك ڕێکاو ئامرازو شێوازی تایبەتی خۆی هەیە بۆ دارشتن و دروستکردنی تایبەتی ( تایبەتی ) لە ئەدەب و زمانی کوردیدا بە زۆر جۆرو بە هۆی زۆر ئامرازەوە دێتە دی. گرنگترینیان ئەمانەن:

١ ـ بە هۆی بەکارهێنانی نەفی و هەڵاواردن ـ استثناء ـ ەوە . ئەوەیە کە لە پێشدا شتێك نەفی بکەی ، پاشان کەسێ یا شتێ لەو نەفییە بپەڕێنە دەرەوە تا فەرمانی نەفییەکەی بە سەردا نەکەوێ و بە تەنیا بمێنێتەوە ...

وەکو ( کەس نەهاتۆتە کوردستان ، کەریدە نەبێ .. )

لە کوردیدا بەزۆری هەڵاواردنەکە پێش نەفییەکە دەکەوێ . لەرستەی پێشوودا دەڵێین : کەریدە نەبێ ،کەس نەهاتۆتە کوردستان ، ئەمەش هەندێ ئامرازی هەڵاواردن ، کە شێوازی ( تایبەتی ) یان لێ دروست دەبێ :

• نەبێ : مەیلەکەم هەیە مەیلانێ ، لە ناو بزخچەی سـولتانی ، خـوا ( نەبێ ) کەس نازانی . !

• جگە ـ بێجگە ( بێجگە ) لە تۆ کەس ناناسم

• بەولاوە : لە تۆ ( بەولاوە ) ناچمە لای کەس .

• ترازان : لەو کتێبە ( بترازێ ) هیچ کتێبێ ترم نادەمێ .

• بێلـە : ( بێلە ) باوکم کەس یارمەتیم نادا .

• لێی دەرچێ : ئازادی ( لێ دەرچێ ) هەموو قوتابییان هاتبوون لە قوتابخانە

• بێ ( بەبێ ) : ئـاڵ دەڵێ !

لـــه لای من هاو جوردی ئاس و ئەجناس
کەسی تێدا نی‌یە ئەم شـاره (بێ تۆ )

٢ ـ ئەوەی ... ئەمە دەوریکی وەکو .مێ مەرج دەگێرێ ، بۆیە یاهەر لاکەی مشبتە وەکو ( ئەوەی کردی بردی ) . یا هەردوولای نەفی. وەکو ( ئەوەی نەکا ناخورا

٣ ـ بە هۆی بەکار هێنانی هەندێ وشەوە کە تایبەتی‌یەکە دەردەخەن دەیچەسپێنن . وەکو :

• تەنیا ( تەنها ) پیرەمێرد دەڵێ
تەنها کاجرۆتێ زیان دەنوێنێ
گەچی کاکەڵێ تیرە دەکلێنێ

• بەس کۆران دەڵێ :
نە لە شارو نە لە دێ
ئەم دی کەس
وەك تۆ جوان بێ
تۆیت و بەس

• هیچی تر وەکو « مژدە چەوزکەکەی خوێندەوەو هیچی تر

• هەر : حاجی دەڵێ :
هەر کوردە لە بەینی کوالی مهللەت
بێ بەهرە لە خوێندن و کیتابەت

٤ ـ بە هۆی بەکار هێنانی هەندێ ئامرازی لێکدەرو پەیوەندی وەکو
• نەك : « ئازاد توتابی‌یە نەك کریکار »
• بەڵام : « ئازاد کریکار نی‌یە بەڵام توتابی‌یە » .
• بەلکو ئازاد کریکار نی‌یە بەلکو توتابی‌یە

٥ ـ پێشخستن : زۆر جار وا دەبێ تایبەتی وا دەردەبڕێ کە :

وشەی دەبێ دوا بخرێ پێش دەخرێ . وەکو : کوردم ئەمن . واتە من کوردم نەك نەتەوەیەکی تری وەکو فارسی یا تورك یا جارەب .
٦ ـ بەکارهێنانی راناوی جوێ لەباتی راناوی لکاو . وەکو . ( ئەمە برای منە ) لە جیاتی ( ئەمە برامە ) .
دیوەر دەڵێ

تیمەنی باغی بەهەشتە غونچەیی خەندانی خۆم
حەسرەتی ئاوی حەیاتــە قەترەی گریانی خۆم

لێرەدا راناوی (خۆ) دەوری پێشاندانی تایبەتی گێراوە . چونکە راناوی ( خۆ ـ م ـ مان ـ ت ـ تان ـ ی ـ یان ) دەورێکی تایبەتی دەگەیەنێ .
ئەمە هەندێ شێوازی دروستکردنی ( تایبەتی ) بوو لە زمانی کوردیدا . بێجگە لەمانەش گەلێ شێوەی تر هەن بەڵام ئێمە بەوەندە وازمان هێنا نابێ ئەوەش لە بیربکەین کە وشەی تایبەتی خۆی لە خۆیەوە ئامرازێکی بەکارو بەهێزە بۆ دارشتنی شێوازی ( تایبەتی ) . وەکو « ئەم کتێبەم بە تایبەتی بۆ تۆ هێناوە . » . « بە تایبەتی هاتوومەتە سەردانی تۆ . »

# بەشی سێیەم
## یەکسانی ، کورتبڕی ، درێژبڕی

یەکسانی هەر لەو نووسین و ئاخاوتنێك دوو لای هەیە . ووشە و گوزارە . ئەگەر لەگەڵ ووشەکانی سەروبەر بەقەد گوزارەکە بوو ، گوزارەکەی بە ئەندازەی ووشەکان بوو ، بەو پەیوەندییە دەگوترێ « یەکسانی » . ( یەکسانی ) وەکو تەرازوویەك وایە ئەگەر ووشە بخەیتە تایەکێ و گوزارەکان بخەیتە تا یەکەی تر تەرازووەکە راست رادەوەستێ . نە ووشەکان لە ماناکە زیاترن و نە ماناکەش لە ووشەکان دەکەیەنێ .

جا لێرەدا ئەم یەکسانییە بۆتە پێوەرو پارسەنگێك بۆ دەست نیشان کردنی کورتبڕی و درێژبڕی . واتە کورتبڕی لە چاو یەکسانی کورتبڕییە ، هەروەهاش درێژبڕی .

لە یەکسانیدا نموونەمان گەلێ زۆرە . با ئەم رستەیە وەربگرین « ئازاد پێری بە سەیران چوە هەورامان . » ئێمە لەم ووشانەدا مانای تایبەتی وەردەگرین .. جا ئەگەر هیچ ووشەیەك لەم ووشانە لا ماناکە وەکو خۆی نامێنێتەوەو ئەویش کەم دەکات کەوا بوو ووشە بە قەد ماناکەن . ، لە هەمان کاتیشدا رستەکە بێجگە لەم مانا مانایەکی زۆرتر هەڵناگرێ .

کورتبڕی لە رەوانبێژیدا ئەوەیە کە مانای زۆر بە ووشەی دەربڕێ . واتە ئەگەر ماناو ووشەکان بەرانبەر بکرێن ووشەکان لە ، کەمتر بن و تەرازووەکە بەلای ماناکەدا بێ ... ئەمەش یا بەهۆی لا

هەندێ ووشە دەبێ کە لابردنەکەیان کارنەکاتە سەر ماناکە ، یا بە تایبەتی - قصر - کردنەوە دەبێ

کورتبڕی لە بەر ئەوەی کە ووشەی کەمتر بەکاردێنێ ، هەوڵدەدا تۆزەی ئەمە بە خەست کردنەوەی مانای زۆر بکاتەوە . بەم جۆرە لە کورتبڕیدا ئیحای ووشەکان زیاتر دەبێ و ماناکە زیاتر قووڵ دەبێتەوە و ووشەکان جگە لە مانای ئاشکرا سێبەری مانای پەناوەکی تریش پێشان دەدەن ، ئەمەش دەرفەتێک باش بۆ گوێگر دەرەخسێنێ تا بەووزەبێ و خەیاڵی بخاتە لێکدانەوەی مانای ئاشکرای ووشەکان و مانای ئەو دیوی ووشەکانیش بدۆزێتەوە . کورتبڕی ئەم سیفەتە خەست و قووڵەی هەیە بۆیە لە شیعردا زیاتر بە کاردێ تا پەخشان . چونکە شیعر زیاتر روو لە ئیحاو رەمز و خەستی دەکات و پەخشانیش پتر بایەخ بەلایەنی رون کردنەوە و لێک کدانەوەی باسەکە دەدات لە شیعردا مانا و مەبەستەکان لە ئەنیشت یەک دەترنجێن و دەچنە بارێک وای لێدێ دیرە شیعرێک جێگای مانایەکی زۆر زۆری تێدا دەبێتەوە . ئەگەر بێت و هەمان مانا بە پەخشان دەربڕێ چەند دێرێکی دەوێ تا هەمووی دەکەوێتە سەر کاغەز ...

بەکورتی ، ئەم پیشە ئەشەیکە دەورێکی زۆر و جێگایەکی بەرزی لە زانستی رەوانبێژیدا هەیە . کۆنێ زانای رەوانبێژی پایەی کورتبڕییان بەرز کردۆتەوە و بارتەتای سەراپای رەوانبێژییان داناوە . چینەتێک دەڵێ : « بۆی هەیە نهێنی رەوانبێژی لە کورت کردنەوە و خەست کردنەوەدا مەبەستەکە بێ . یەکەم جۆر بروالی هەست و بیری پیاو ئەوەیە کە زوو ، بەکەمترین ووشەو زووترین کات بکاتە ئەنجام . »

هەندێ زانای رەوانبێژی عارەب وەکو جاحظ و ابن المقفع و أکثم بن صیفی و ابن سنان الخفاجی و شبیب بن شبه و هی تر لەو بڕوایەدان کە رەوانبێژی

لە کورتبڕی دایە کە کورتە ڕەوانبێژی، واتە کورتبڕی و کە کورتە کراو و
واتە ڕەوانبێژی بە هەموو ئەدارەکەوە .

کوردیش هەر بە سروشتی خۆیەوە حەزی لە کورتەو کورتبڕی بووە
ڕقی لە درێژدادڕی و چەنەبازی بۆتەوە . . کورد هەمیشە هەر بەدوای
( کورتی بێ کلک ) و ( کورت و کرمانجی ) و ( درێژەی نادەینێ ) ،
( زۆران بۆ کێمان مەڵێ ) دا گەڕاوە و لـــە گێڕانەوەی باس و خوای
دونیادا نەیویستوە سەری گوێگر بە زۆرگۆتن بێشێنێ «سەرت نەیەشێنم»
لەو بڕوایەدا بووە « ئەوەی کەس بێ ئەلفەکی بەسە » و « قسە هەزار
دووی بەکارە » . بۆیە هەمیشـە کورتبڕی لە قسەو نووسیندا پەسەند
کردووە . شوکری فەزلی دەڵێ

شـا وەکو شاێکی شـــەترەنجە لە عالەم ئەمڕۆ
کەورە قانوونە ـ قسەی کورت ئەوەیە درێژی نەکەی .

( نـالی ) ش یەکێکە لەو شاعیرە ووردو ئوول و وەستایانەی کە ڕوو
کردۆتە ســنعەتکاری بەرزو ووردەکارییەکی بێ وێنەی لە داڕشتنی
شیعرەکانیدا نواندووە هەمیشە هەوڵی داوە کە مانای زۆر و گەورە بە
ووشەی کەم و بچووک دەربڕێ ، و شانازیشی پێوە کردووە ،

نـالی عەجەب بە ئووحەو حیکمەت ئەدای دەکا
مەعنای زۆرو گەورە بە لەفزی کەم و بچووک

خانی دەڵێ

ئەی خامە تەژی کەلەك درێژکر ئەڤ نامە بەسە ئەچر ترێژکر
هەر چەندە کلام شبهی دوڕ بت بێ لەفز دبت دەما کو پڕبت
نابینی بە لیمانت جەواهـــر ئەوڕا کو دەندەکی دنـاڤر

## جۆرەکانی کورتبڕی :

کورتبڕی دوو جۆرە : بە بێ لابردنی هیچ وشەیەکو بە لابردنی وشەیەک یا کۆمەڵە وشەیەک .

- کورتبڕی بێ لابردنی هیچ وشەیەک . پێیەش دەگوترێ کورتبڕی ئاپاڵ ئەوەیە کە وشەکان مانایەکی زۆر بدەن بە دەستەوە دوای لێکدانەوەو شیکردنەوەی وشەکان بۆ گوێگر دەردەکەوێ . بۆ نموونە کە دەڵێی « پیاوی زانا تێناکەوێ . » ئەم رستەیە هیچ وشەی لێ لانەبراوە بەڵام ئەگەر لێی ووردبینەوە دەبینین مانایەکی قووڵو فراوانتر لەوە هەڵدەگرێ کە تەنها وشەکان پێمانی دەدەن . چونکە پیاو کە زانا بوو دیارە لە شت دەگاتو زوو خۆی نادا بە دەستەوە . هەر رووداوێکی بێتە پێش لێی ورد دەبێتەوەو هەڵکێڕو وەرگێڕی دەکات و هەڵی دەسەنگێنێ ، خۆی ئەنجامەکانی دیار دەکات ، لەمەش دەگاتە ئەوە کە خۆی لە رووی مەترسی رووداوەکە بپارێزێ و بەمەرەش قەت تێناکەوێ .

یا وەکو : « سوار تا نەگلێ نابێ بە سوار » لێرەدا هیچ وشە لانەبراوە، بەڵام ئەم وشانەی کە هەن لێکدانەوەی دوورو درێژ هەڵدەگرێ. سوار تا نەگلێ بێ باکە . بایەخ بە سواری نادا . لە سوارچاکی نازانێ . بەڵام کە گلا ئنجا بە چاوێکی ترەوە سەیری ئەسپەکەی و مەشقو مەیدانداری دەکاتو لە ترسی گلان خۆی دەخاتە ژێر ووریایی و مەشقێکی زۆرو ئیدی سوارێکی چاکی لێ دەردەچێ ئەگەر نەگلابا ، ئەو پەندەی وەرنە دەگرتو نەدەبوو بەم سوارە .

٢ - کورتبڕی بە لابردن . ئەوەش وا دەبێ کە ئەرازووی ماناکە لەبەر ئەوە دابلەنگێ چونکە وشەیەک یا زیاتر لە رستەکە لابرابێ و لابردنەکەش نابێ کار لە ماناکە بکات . ئەگەر کاری تێبکات نابێ کورتبڕی .

کورتبڕی یۆیە کورتبڕی‌یە چونکە وشەکان کەمن و ماناى زۆریان داو
بە دەستەوە. ئەوەش کە لە ڕستەکەدا لادەبرێ دەشێ ئامرازێك بێ یـ
ناوێك بێ یا سیفەتێك بێ یا چەند وشەیەك بێ... هتد..

وا بە کورتی باسی هەندێکیان دەکەین :

• لابردنی ئامراز : وەکو نالی دەڵێ

مو و سونبلی ئاشفتە ، دور دانەی ناسوفتە
دەم خونچەیی نەشکوفتە ، تێ بکرە کورە یا کچ

نالی لەم دێڕە هۆنراوەیەدا سێ لێکچواندنی - تشبیه - ی هێناوە وەکو سونبولی ئاشفتە ، دان وەکو دوڕی ناسوفتە ، دەم وەکو خونچا نەشکوفتە ... لەم هەرسێ لێکچواندنە ئامرازی لێکچواندنی فڕێ داوە کە (وەکـ
•. بـــەمەوەش لێکچواندنەکان پلەیەك زیـاتر بەرەو بەهێزی هەڵکشاون بوونەتە لێکچواندنی ڕەوان - التشبیه البلیغ - ( ١ )

• لابردنی موزاف وەکو ( گوند هەموو تێ کەیشت )
واتە خەڵکی گوند. لێرەدا ( خەڵك ) کە موزافە فڕێ دراوەو ماناکـ کەم نەبۆتەوە هەروەکو خۆی ماوەتەوە .

• لابردنی موزاف [ الیه ] . وەکو ( قاسپە قاسپی بەیانیان خۆشـ
واتە قاسپە قاسپی کەوی بەیانیان خۆشە

• لابردنی مەوسووف . وەکو ( تۆ ئازای ! ) واتە :
( تۆ پیاوێکی ئازای ! )

لابردنی سیفەت . وەکو « هەموو باڵندەیەك پێچووی » خۆی خۆش دەو
واتە هـــەموو بـــاڵندەیەکی پێچوودار - خاوەن پێچوو - پێچووی .

---

١ بڕوانە بەرگی یەکەمی ڕەوانبێژی - بەشی لێکچواندن -

خۆش دەوێ
مەرج . مەرجیش زۆر شت دەگرێتەوە . « ئامرازی مەرج »
کرداری مەرج وەڵامی مەرج
لابردنی ئامرازی مەرج وەکو پەشێو دەڵێ

بچینە ئەدوریەوە لە کۆن پەندی وا هەبوو
منیش لە زۆر هەردم چاند بە رەهێڵم بڕوا هەبوو

( بچینە ئەدوریە ) واتە [ ئەگەر بچینی ئەدوریتەوە ]
لابردنی کرداری مەرج وەکو ( وەرن ، سەردەکەون )
واتە ( وەرن ، ئەگەر بێن سەردەکەون . )
لابردنی وەڵامی مەرج وەکو ( وای دەنا بت دیبایە چی بە سەر مانبوو ) واتە ( بت دیبایە شتێکی نەشارو عاجباتی بوو دەهـ دی . ئەمە هەمیشە بۆ سەر سوڕمانە
. یا وادەبێ رستەیەکی تەواو لابیرێ ئەورستەیەش یا هۆیە، یا بەرهۆیە
١ ئەگەر هۆبێ وەکو ( پێم گوت بخوێنەوە ، هەموو رایان لە خوێندنەوەکەی بوو . واتە پێم گوت بخوێنەوە ، خوێندیەوە هەموو رایان لە خوێندنەوەکەی بوو لێرەدا رستەی ( خوێندیەوە ) لابراوە . ئەو رستەیەشە کە بۆتە هۆی رازی بوونی هەموو لایەك .
٢ ـ بەرهۆ وەکو : ( بۆیە ئەمناردی بەیەکجاری بڕی بەڵکو بێتەوە . )
واتە بۆیە ئەمناردی بەیەکجاری بڕۆی بەڵکو ـ بۆیە تۆم نارد ـ بێتەوە رستەی ـ بۆیە تۆم نارد ـ لابراوە . ئەوەش بەر هۆیە
. لابردنی پرسیار . زۆر جار وا دەبێ لەگەڵ رستەیەکی وا دێتن وەکو ئەوە وابێ کە وەڵامی پرسیارێك بێ ؟ ئەگەر چی پرسیار، کە ئەبێ کراوە وەکو :

( پارمەتی ئازادم دا چونکە پێویستی بە پارمەتی بوو ) .
وەك ئەوەی کە پرسیاری لێ کرا بێ [ بۆ یارمەتی ئازادت دا ؟ ]
. وا دەبێ رستەیەك زیاتر لابراێ . وەکو ئەوەی کە ( گێڕرا
لە وەرگێڕانی ( شازادەی بەختیار ) دا دەڵێ
( خوای گەورە فەرمانی دا بە فریشتەیەك وتی
- بچۆ بە ناو ئەو شارەدا بگەڕێ دوو شتی هەرە بەنرخم بۆ بدۆ
بۆم بێنە !
فریشتە دڵە توورتوشمەکەو لاشەی پەرەسێلکەکەی بۆ هێنا . خ
گەورە بە فریشتەی فەرموو
« - دەست خۆش ! چاکت هەڵبژارد . . . »
لە دوای ووشەی ( بۆم بێنە ) دا دەبوا بڵێ « فریشتە چو بە
شارەکەدا گەڕا چاوی بە زۆر شتی بە نرخی کەوت لە ناو هەموو
بە نرخەکاندا دڵە توورتوشمەکەو لاشەکەی پەرەسێلکەکەی دەست ن
کرد هەڵی گرتنو » ئینجا پاش ئەم هەموو رستانە بێتەوە سەر ئە
بڵێ « فریشتە دڵە توورتوشمەکەو لاشەی پەرەسێلکەکەی بۆ هێنا »

## بەکارهێنانی کورتبڕی . بۆ ؟

بێ گومان نووسەر یا ئەکەر کە پەنا دەباتە بەر کورتبڕی
پیشەیەکی رەوانبێژی و ئامرازێکی دەربڕینی هەستو نەستی دەر
خۆی بەکاری دێنێ . هێزی تایبەتی خۆی هەیە ئەمەش هەڵدێ لەوە
١ - ئەو رستەیەی بە کورتی دا دەڕژێ پتەوترو کوژترەو بەش
و کاریگەرترەوزیاتر کار لە ووروژاندنی جۆشی دەروونی گوێگر دەک

له بەرکردنی ئاسانترە .

٢ یا وا دەبێ قسەکەر ماوەی زۆر نەبێ‌و بیەوێ ڕەزیلی بە کاتەکە بکات‌و بە ووشەی کەم ئەنامەت بکات لێرەدا هەم کاتێکی زۆری ناوێ‌و هەم ووشەش پاشەکەوت دەکات .

٣ ـ کورتبڕی لە بەر ئەوەی لە ڕستەی ئاسایی کورترە مەبەستەکە خێراتر دەگەیەنێ بۆیە باسەکە زووتر دەگاتە ئامانج‌و باشتر دەچێتە ئەقڵەوە .

٤ ـ جاری واش هەیە دەرفەتەکە ئەوەندە تەنگە قسەکەر ماوەی ئەوەی بۆ نامێنێتەوە بە درێژی باسەکە بخاتە ڕوو ئیدی ناچارە پەنا دەباتە بەر کورترین شێوەی دەربڕینی مەبەست .

٥ ـ جاری واش هەیە قسەکەر بۆیە پەنا دەباتە بەر کورتبڕی چونکە مەبەستێکی تایبەتی هەیەو دەیەوێ بە یەکێکی تایبەتی بگەیەنێ‌و گوێگرەکانی تر تێ‌یان نەگەن بۆ ئەمەش تەنیا ئەوەندە ووشەیە بەکاردێنێ کە خۆی‌و بەرامبەرەکەی لە مەبەستەکە بگەن‌و پاپی ئەوە ڕوونی ناکاتەوە کە لە ...ەکەکە ئاشکرا بێ .

• • •

## درێژبڕی :

درێژبڕی پێچەوانەی کورتبڕییە . ئەوەیە کە وشەکان لە مانا زیاتر بن . واتە تۆ بۆ دەربڕینی مانایەکی تایبەتی وشەی زیادە بەکار دێنی و لەم بەکارهێنانەشدا مەبەستی تایبەتی خۆت هەیە هەر بۆ درێژ پێدان و وشە هێنانی رووت بەکاری ناهێنی بەڵکو بۆ ئەوەتە بەم و زیادانە یا مەبەستەکە زیاتر روون بکەیتەوە ئەوەک گوێگر بە تەواوی لەی ئاگا یا باشتر بیچەسپێنی و بیخەیتە ئەقڵەوە ئەوەک گوێگر تەواو باوەڕی پێ بێ یا بتەوێ جەخت لە سەر شتێک بکەیت و بایەخی زیاتری پێ بدەی و یا هەر مەبەستێکی تر . بەکورتی درێژبڕی دەبێ خۆ هێنانەدی ئامانجێکی تەکەر بکات . خۆ ئەگەر هیچ سوودی تێدا نەبێ تەنیا درێژبڕی بێ بۆ درێژبڕی ئەو جا لە هەموو سیفە ڕەوانبێژی دەشۆرێ و دەبێتە درێژدادڕی ... درێژدادڕی و درێژ هەرتیا نەعەرد و هاسمانە .

درێژبڕی بۆ گەلێ مەبەست بەکاردێ ئەمەش هەندێ لەم مەبەستانە

١ - بۆ روون کردنەوەی شتی ئاڵۆز وا دەبێ کە هەر قسەیەکەی ئاڵۆزییەکی تێدابێ ، یا تۆ وا تێ بگەی ئاڵۆزییەکی تێ گوێگر لە مەبەست حاڵی نابێ بۆیە پەنا دەبەیتە بەر روون کردنەوەی مەبەستەکە تا گوێگر بە تەواوی وەری بگرێ و بەجۆرێکی تری لێکنەدا دلدار دەڵێ

زڕخی ئارەقەی ڕوونی ماندووییم
تیکە ئانێکە . چ نان نانی جۆ .
ئەویش بە بێ دۆ :

لێرەدا ئەگەر دڵدار بیگوتایە ( نرخی ئارەڵەی ڕوونی ماندوویم تیکەنانێکە ) ولەوێ بوەستایەو ڕوونی نەکردایەوە گوێگر لەوانەیە وای بگەیشتایە کە ئەو نانە نانێکی کەمەو پێخۆریشی لەگەڵدایە جا بۆ ئەوەی گوێگر شتی وای بە خەیاڵدا نەیێ و تەواو لە حاڵەتی کابرا بگات ، هەستاوە زیاتر ڕوونی کردۆتەوە کە ئەو تیکە نانە نانی جۆیە . نەك هەر نانی جۆیە ، لە هەموو پێخۆری خۆشی دوریدا دۆیشی تی یە ئەو تیکە نانە جۆیەی پێ بخوا . دیسان دڵدار دڵێ :

گەر یارەت دەوێ نوتن سەلەم کە

لە سەر بەشی خۆت هەرچەندی بکا

لێرەدا کە دەڵێ نوتن سەلەم کە ڕەنگە پیاو وای بۆ بچێ کە ئەو سەلەمە لە سەر حسابی بەرووبوومی زەوییەکە بێ کە هەردوولا بەشدارن بەڵام وانییە هەر بۆیەشە دڵدار زیاتر ڕوونی دەکاتەوە کە ئەو سەلەمە دەبێ لە سەر بەشی جوتیاری کڵۆل بێ نەك تێکڕای بەرهەمەکە

٢ ـ ناوبردنی شتێکی تایبەتی پاش شتێکی گشتی ئەوەیە یەکەم جار بە گشتی باسی شتێك بکەیت و پاشان باسەکە تایبەتی بکەی بە بەشێکی شتە گشتییەکە ئەمەش کە دەکەی بۆ جەخت و تەئکید کردنە لەسەر بەشە تایبەتییەکەی شتە گشتییەکە . دڵدار دەڵێ :

خێرا هەستاوە بە ڕوویەکی خۆش

وتی : بەخێربێن . بەخێربێی کێنخوا

کە گوتی ( بەخێربێن ) ئەمە شتێکی گشتییە چونکە بەخێرهاتنەکە هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە هاتوونەتە ئەوێ کێنخواو غەیری کێنخواش دەگرێتەوە . پاشان بەخێرهاتنەکە تایبەتی دەکا بە کێنخواو دەڵێ ( بەخێر بێی کێنخوا ) . ئەمەش دیارە بۆ جەخت و پێداگرتنە بکرە لە

ترسانە چونکە چارەنووسی ئارەق ڕشتنی دوازدە ساڵەی لەدەست کێشا

٣ ـ ناو بردنی شتی گشتی پاش شتی تایبەتی ئەوەیە پێشان ناوی شتێکی تایبەت و پاشان باسی شتێکی گشتی بکەیت کە ئەو شتە گشتییە شتە تایبەتە‌کەی پێشووش بگرێتەوە وەکو : «هەولێرو هەموو شارەکانی کوردستان خۆشە » لەپێشا ناوی « هەولێر »ی هێناو پاشان گرتوویە هەموو شارە کوردستان کە ئەم قسەیەش هەولێرەکە هەر دەگرێتەوە جا کە ناوبردنی وەك شتێکی تایبەتی و پێش خستنی لەسەر شتە گشتییە بۆ زیادە پێداگرتنە .

٤ ـ ڕستەی هەڵوەستە (جملة اعتراضية) ئەوەیە کە قسەکەر لەناو قسە کردنا هەڵوەستەیەك بکات و بۆ مەبەستێکی تایبەتی ڕستەیەکی لاوەکی بێنێتە پێش کە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە قسەکەوە نییەو پاشان بگەڕێتەوە سەر جارانی و پێدا بڕوا وەکو : سالم دەڵێ :

لەلای سالم ئەگەر ئەگلە وەکەر شورب

بەبێ تۆ دوور لە تۆ سندانە ئیمشەو

ڕستەی دووەم ئەوەیە کە بڵێ بەبێ تۆ سندانە ئیمشەو بەلام لێرەدا دەیەوێ سندانە لە پارەکەی دوور بخاتەوەو هاتووە لە پاش « بەبێ تۆ » هەڵوەستە کردووەو قسەی پچڕاندووەو گرتوویە « بەبێ تۆ » ئینجا هاتۆتەوە سەر قسە تەواوی کردووە هێنانی ئەم ڕستەی هەڵوەستەی بۆ زۆر مەبەست دەبێ هەندیکیانن :

١ ـ دوعاو پاڕانەوە : ئەوەیە کە ڕستەی هەڵوەستە پاڕانەوەی تێدابێ ، ، نموونەکەی پێشوو دوعاو پاڕانەوە بۆ ئەوە بوو کە سندانەکە لە پارەکەی دوور بێ یا وەکو زیوەر دەڵێ :

چەکی هەر میلەتێ هێلم و مەعاریفە بۆ ژیانی خۆی
لە ناو ئێمەیش خوا فەوتی بکا جەهلە چەکی خێڵە

رستەی هەڵوەستەی «خوا فەوتی بکا»، دوعا کردنێکە لە چەکی خێڵ و نەتەوەی ئێمە کە ئەویش جەهلە. زۆر جەهلەکەی بەلاوە ئەوەندە پیس و بە مەترسییە قسەی خۆی بڕیوەو دوعای لێ کردووە کە لەناو بچێ ئینجا هاتۆتەوە سەر قسەی خۆی و تەواوی کردووە.

٢ - پیشان دانی گومان و دوودڵی وەکو مامۆستا علاءُ الدین سجادی دەڵێ:
( چاری سەپانیەکەی خۆم ئەگەر چنگم کەوێ کەڵکێکمان لێ دەگرێت، بەڵام بڕوام پێ بکە دوو بەش بەهەتی بێکارو بارەدارو چەوری‌یە سانا ئەڕوا
ئەگەر نەیگوتبایە - ئەگەر چنگم کەوێ - ئەوا قسەکەی لای مزگەر بوو سەپانیەکەی هەر دەبێ و کەڵکێکیشیان دەگرێ. بەڵام کە گوتی - ئەگەر چنگم کەوێ - ئەم هەڵوەستە کردنە گومان و دوودڵییەک پەیدا دەکات بەرامبەر سەپانی‌یەکە

ئەمەوا هەڵوەستان بۆ گەلێ مەبەستی تریش بەکاردێ، کە پێی ناوێ زیاتری بەدوادا بچین. هەر ئەوەندە دەڵێین لە موردەوانی خۆماندا گەلێ رستەی باوی هەڵوەستە هەن کە لە کاتی قسەکردن و گێڕانەوەی باس و خواس و دەمەتەقێدا دەگوترێن و بوون بە باوو کەوتوونەتە سەر هەموو زارانەوە. وەکو: بەحاشا لە حازری - حاشا کی لەو جەماعەتە - پەرژێن بێ - خوا عەمر درێژی کا - خوا لە پەنای خۆی گرێ - بەکوشتن چی - خێر لە خۆی نەبینێ - سەرت نەیەشێنم - خوای لێ خۆش بێ - جێی بەهەشت بێ - شەیتان بە لەعنەت بێ - بە رەحمەت بێ - خوا مەرتەبەی گەورەکا - دوور بێ - خوا نەکا - خوا نەگەرێنێ - گوێی شەیتان کەر بێ - بسم الله -

- بێ ئێوە ناخۆش ـ لە ڕووی تۆ ئەلێم ـ لە ڕووی حازریان ئەلێم ـ » هـ
ڕستەی هەڵوەستەی تریش کە لەکاتی قسە کردندا بەکار دێن

٥ ـ دووپات کردنەوە : وادەبێ درێژبڕی لە ئەنجامی دووپاته کرد
ووشەیەك یا ڕستەیەك دەبێ . بەڵام دووپات کردنەوەکە هەروا خۆڕ
مەبەستێکی تایبەتی دەگەیەنێو خەزمەتی لایەنێکی مانای نـاو ئاخ
دەکات . وەکوو ئەوەی بۆ چەسپاندنی واتاکە بێ له مێشکی گوێ
یا بۆ پیشاندانی داخو خەفەتو پەرۆشی ، یا بۆ دامەزراندنی سە
کێشی ەوزنراوە ، یا بۆ کۆتایی هێنانی ئاخاوتنو بەجێ هێشتنی کاری
تایبەتی لە دلی گوێگر ویـا بۆ ەوەیە هەموو لایەکی شتە باس
دابگرێ ٠ ١ نموونەیەك : سەلام دەڵێ

ئەیجولی گوێ چەم ، ئەیجولی گوێ چەم
سایە بانی یارـ سینەو خـاڵو مـــەم

دووپات کردنەوەی ( ئەیجولی گوێ چەم ) بۆ کردنەوەی سەرەتای
و دامەزراندنی هەوای کێشەکەیە

٦ ـ تەواو کردن . ئەوەیە درێژبڕی بۆ تەواو کردنی ماناکە بێ
« ئەمانە هەر لە ناوەخۆ خراپن لە گەڵ بێگانە باشن » کە لـە
یەکەم دا گوتت هەر لە ناوەخۆ خراپن خراپییەکە تایبەتی دەبێ
خۆیان و ئینجا کە گوتت لە گەڵ بێگانە باشن ئەمە تەواوکردنی
ڕستەی پێشووە

---

(١) بۆ زیـاتر ڕون بوونەوەی ئەم مەسەلانە تەماشای لاپەڕە (٧
ی بەرگی دووەمی ڕەوانبێژی بکە لەوێ بـــە دوورو درێژی بـا
شـانە کراوەو نموونەیان بۆ هاتووە بۆیەش لێرەدا درێژەمان بەباسە

٧-جۆرێکی تری درێژبڕی هەیە بۆ جەختی پێداکردن بەکاردێ وەکو
- بەچاوی خۆم دیم - بەو گوێیانە بیستم . گۆران دەڵێ :

منیش وەك تێوە لە دونیای گەورە گەردێکم بچووك
هەتا ناتوانم بفڕم بخوێنم، بەباڵ بەدەنووك .

ئاشکرایە کە خوێندن بە دەنووك و فڕین بە باڵ دەبێ . دەیتوانی ناوی (باڵ) و (دەنووك) هەر نەهێنێ ، کە هێناویە بۆ ئەوەیەتی جەختلەسەر شتەکە بکات ..

زۆر جار نەك هەر دەگوترێ بەچاو دیتم بەڵکو بە چاوی سەری خۆم دیتم . وانە شوێنی چاوەکەش دیار دەکات کە سەرە ئەمەش لە لاوکی کوردیدا زۆر باوە . لە بەندێکی لاوکی جەنز مانووە دەڵێ

شیبانانا دکز نامۆ خێرێترە خێر بێتە رها تە
دکز چ خێر بێژم خێر بێتە ربا مـــن
ئەما منێ بە چاوێ سەرێ خۆ دیتبوو
لە برینێ جەنەرێ والما دێتن دوورمانا وێ لەلورنێ .

## بەکارهێنانی درێژبڕی . بـــۆ ؟

پاش ئەوەی کە مانای درێژبڕیو هەندێ جۆری درێژبڕیمان بە نموونەوە خستە بەرچاوان دێینە سەر ئەوە کە درێژبڕی بۆچی بەکاردێ و قسەکەر سەبارەت بە چی پەنای دەباتە بەر

١ - بۆ ئەوەی بەو درێژبڕییـــە ماناکە لە دڵی گوێگردا بچەسپێ و هەموو گومان و دردۆنگی‌یەکی لە دڵ بڕەوێتەوە .

٢ - بۆ ئەوەی ماناکەی بە تەواوی بەڵ ڕوون بێتەوەو هیچ ئاڵۆزی و نوێنی‌یەك لە مەبەستەکەدا نەمێنێ .

٢ - بۆ ئەوەی گەورەیی و مەزنی‌یەك بە ماناکەو بە گوێگر بدات

## پوختەی ئەم بەشەو چەند تێبینیێك

له بەرامبەر کردنی ووشەو گوزارەی هەر ئاخاوتنێك یان نووسینە ووشە گوزارەکان بەقەد یەکترن و ئەگەر ووشە بخەیتە لایەکی تەرازوو و گوزارە بخەیتە لاکەی تر تەرازووەکە ڕاست دەوەستێ و بە هیچ لایەکـــدا ناڵەنگێ خۆ ئەگەر بە ووشەی کەم و بچووك مانای زۆر و گەورەمان دەربـــڕی واتە ئەندازەی گوزارەکە لەچاو ووشەکان زیاتر بوو جا ئەو زیادەیە چ لەبەر لابردنی هەندێ ووشە بێ و چ لەبەر فراوانی ماناکە خۆی بێ، ئەوا دەبێتە کورتبڕی، بەڵام ئەگەر ووشەی زیادمان بۆ گەیاندنی گوزارەیەکی تایبەتی بە-کارهێنا، جا ئەو زیادەیە بەهەر مەبەستێك بێ ئەو حەڵە دەبێتە درێژبڕی .

مایەوە سەر ئەوە ئایا ئەم شێوانە کامەیان پەسەندترو بەکاربکەرتـــرەو لە-کەر کێیەیان بەکارهێنان باشە . لەڕاستیدا ، ناتوانین هیچ یەکێ لەم شێوانە بەشێوەیەکی موتڵەق لەوانی تر پەسەندتر بکەین . چونکە هەر یەکێ لەم پێشە ڕەوانبێژییانە جێگای تایبەتی خۆی هەیە . یەکسانی لە جێگای خۆی پەسەندەو کورتبڕی لە شوێنی خۆی و درێژبڕی لە ناوچەی خۆیەوە بەکارە . شوێنی کورتبڕییت بوێ و تۆ درێژبڕی بەکاربێنی نرخی قسەکەت دەشکێ هەروەهاش شوێنی درێژبڕییت گەرەك بێ و تۆ پەنا بەیتە بەر کورتبڕی ناکەیتە ئامانج : بۆیە هەر یەکە لەمانە لەجێگەی خۆیدا بەنرخ و بەسوودو پەسەندە .

بەڵام ئەوەندە هەیە لەبەر ئەوەی کە کورتبڕی خەستترەو سێبەرو ئیحاو بواری لێکدانەوەی زیاتر بەدەمەوە زۆرتر لەهۆنراوەدا دێ تا پەخشان ، کەچی درێژبڕی لەبەر ئەوەی زووی لە ڕوونکردنەوەو لێك کشانەوەو شی کردنەوە دەکات زیاترلـــە پـەخشان بەکاردێ

# بەشی چوارەم
## پێکەوەنان و دابڕین

پێکەوەنان و دابڕین لەوەدەدوێ ئایا کەی دوو ووشە یا دوورستە پەیەکەوە دەلکێن و کەی لەیەك دادەبڕێن . مەبەست بەپێکەوە لکان ئەوەیە کەووشەی دوەم یا رستەی دووەم بکەڕێتەوە سەر ووشە یا رستەی یەکەم و بەشداری هەمان بڕیار و حوکم بکات کەلەوداهەیە ، ئەوەش دیارە بەمزی مەتفەوەدەبێ کەچی دابڕین ئەوەیە کەدوو ووشەکە یا دوورستەکە بە تەواوی لەیەك جیا بکەیتەوە و لێکیان دابڕێنی ، بۆیەش وادەکەی چونکە دوو ووشەکە یا دوو رستەکە هیچ پەیوەندی یان لەنێوانداني یەو هیچ حوکم و بڕیارلکێ هاوبەش نی یە پیانکەیەنیتە یەکترو بەیەکەوە بیانبەستیتەوە . بۆیە لەیەك دادەبڕێن و هەریەکە سەربەخۆ دێ ئەم پەیەکەوەنان و دابڕینە جێگایەکی زۆر بەرزو گرنگی لە زانستی رەوانبێژیدا هەیە ئەوەی بیەوێ پەیڕەوی رێوشوێنی رەوانبێژی بکات و قسەکەی رەوان و بێ گرێ بێ دەبێ زۆر باش ئاگاداری شوێنی پەیەکەوە نان و دابڕینی ووشەو رستەکانی ئاخاوتنەوە بێ . زاناکانی رەوانبێژی بایەخێکی زۆریان بەم بەشەی واتاناسی داوەو بەچاوێکی پڕ نرخەوە تەماشایان کردووە . جاحظ دەڵێ : «لە فارسی یان پرسی : رەوانبێژی چی یە ؟ گوتی : لەیەك جودا کردنەوەی ـ پێکەوەنان و دابڕینـ بینا بەوەی ئەوەوە فارس سەراپای رەوانبێژی بەو، دەزانێ کە تۆ هەتوانی شوێنی پێکەوەنان و دابڕینی رستەکان بزانی . «بزرجمهر دەڵێ :«ئەگەر بەیەکێکت هەلکوت و یەکێکی ترت شووشتەوە دوو قسەکە لەیەك دابڕە تا پێ هەلکوتن و شووشتنەوەکە تێکەڵ نەبن .»

هەریەکە لە پێکەوەنان و دابڕین جێگای خۆی هەیە . لەخوارەوە بەکورتی باسیان دەکەین .

پێکەوەنانی : [illegible] دوو وشە یان زۆرتر [illegible] کە لە پێکەوەنانیان [illegible]
کە بڕیارێکی تایبەتی و هاوبەشیان لە نێوداین . جاری پێکەوەنانی وشە هە

زۆر زۆرە .      مەلای گزیی دەڵێ :

مریشک و هێلکە و چوشتەی کاوڕ
کەرەو داغ زگ و ساوارو هەمانە
کوریس و سێپەک و ناودزک و مەشکە
جەوال و تووره کەو تێزک و خانە
هەمووی حازر بکەن بۆ خۆ خوراندن
دە خێرابن بە چوست و هاتلانە

لێرەدا ئەو گزمەلە شتەی کە لە دوو دێڕی سەرەوە ناوی بردوون و بە [ واو ی پێوەندی بە یەکەوەی لکاندوون هەموویان دەکەونە بەر حوکمی ناوەرۆک دێڕی سێیەم کە بریتییە لە حازر کردنی ئەو شتانە .

سالم دەڵێ :

شیخی سوور یێتن ، وەرن خالێکەمان داغ کەن بە جووت
چونکو ژانمان کرد من و ئەسپم لە بەر سەردی هەوا

لە نیوەی دووەمدا [ من و ئەسپ ] پێکەوەنراون چونکە هەردوولا لەو ، بەشدار کە لە بەر سەردی هەرا ژانیان کردووە .

ئەمە پێکەوە نانی وشە . لەبارەی رستەوەش هەمان شتە ، دەبێتە هەردوو بەشداری بڕیارو ناوەرۆکی باسە کە بۆ ئینجا پێکەوە دەنرێن . لەم شوێنانە خوارەوە رستە بە یەکەوە دەلکێن .

۱ - ئەگەر هەردوو رستەکە تەواو جیاواز بوون لە رووی خەبەرهدارشتنەوە . وەکو : « ئازاد هاتووە ئەوش برۆ » ئەم دوو رستەیە بە هۆ [illegible] [illegible] پەیوەندییەوە [illegible] بە یەکەوە لکاون [illegible] یەکێکیان خەبەرە

رستەی دوورێمێ ...پرتێت پوێت فرمانی تێدایە :

٢- ئەگەر هەردوو رستەکە لە بارەی تخەبەرو دارشتنەوە هاوچەشن بن واتە یا هەردووکیان خەبەربن و یا هەردووکیان دارشتن . ئەوەش هەر ئەوەیە کە دەبێ حوکمێکی هاوبەشیان لە بەین دا هەبێ وەکو ( من چوومە هەولێرو تۆ چوویتە بەغدا ) هەردوو رستەکە رستەی خەبەرین . یا وەکو کاکەی فەلاح دەڵێ

ملی رێ بگرەو برۆ بۆ بەرزی
یا سەرداری‌یە یا سەرداری‌یە

( ملی رێ بگرە ) و ( برۆ بۆ بەرزی ) هەردووکیان رستەی دارشتنن و بە هۆی ( و ) ی پێوەندی‌یەوە بە یەکەوە ئەکاون .

ئەو دوو رستەیەی کە پێکەوە دەلکێن دەبێ تەبسار تفاق بن و بە یەکەوە پەسترێنەوە . بەسترانەوەکەش یا وادەبێ کە پەیوەندی‌یەنیان بە جۆرێکی وا بێ لەگەل یەك بکونجێن وەکو نووسین و خوێندنەوە ، هەستان و . رۆیشتن . بینین و بیستن . یاخود پێوەندی نێوانیان دژوپێچەوانە بێ وەکو پێدەکەنی و دەگری هەڵدەستێ و دادەنیشێ . دێ و دەچێ . بۆیە ئەم پێچەوانەیە دەکەوێتە بەر حوکمی تەبایی دوو رستەکە چونکە هەر کاتێ بیرمان لە ووشەیەك کردەوە یەکسەر پێچەوانەکەی بە مێشکماندا دێ .

دوو رستەکە ئەو حەالە تەبا دەبن کە یا بکەریان لەگەل یەك بکونجێ یا کردار گونجانێ دوو بکەرەکە وەکو : ( ئازاد هات و باوکی رۆیشت ) . ئازادو باوکی پێکەوە دەگونجێن چونکە لە یەکەوە نزیکن . بەلام ئەگەر بلێی ( ئازاد هات ئەل دەفرێ ) ئەم دوو رستەیە ناشێ پێکەوە بلکێن چونکە هیچ پێوەندی‌یان لە نێواندا نیە هاتنی ئازاد لە کوێ و فرینی ئەل لە کوێ . گونجانی دوو کردارەکەش وەکو ( کێلاندار دەزێ و درەخت بەر دەدا ) لێرەدا بە پێوەندی‌یەکی زۆر لە نێوان ( زان ) و ( بەرزدان ) هەیە . بۆیە

هەردوو ڕستەکە بەیەکەوە نراون .

## پەیوەندی نێوان هەردوو ڕستە

گوتمان ئەو دوو ڕستەیەی کە پێکەوە دەلکێن دەبێ تەباو گونجاو بن و پەیوەندیەک هەبێ کۆیان بکاتەوە . ئەو پەیوەندیەش یا ژیری ( عقلي ) یا ڕامانی ( وهمي ) ، یا ئەندێشەیی ( خیالی )

**پەیوەندی ژیری** ئەوەیە کە دوو ڕستەکە

١ - یەکێتی لە نێوان بکەر یا کردارەکانەوە هەبێ وەکو ئازاد پەخشان دەنووسێ و ئەوزاد شیعر

٢ - بەیەک بچن و لە شتێکدا هاوبەش بن وەکو ( حەمز ڕاوکەرەو گۆرانیبێژ )

٣ - یا پێچەوانەی یەک بن وەکو ( سەنین بەرزەو سینەک نزمە ) یا « باب دەکاو کوڕ دەبا »

**پەیوەندی ڕامانی** ئەوەیە کە دوو ڕستەکە

١ - نیمچە پێکچوونێکیان لە نێودا هەبێ وەکو سپی و زەرد ڕامان ئەو دوو شتە دێنێتە پێشەوە بەڵام ئەقل - ژیری - دەرک بە جیاوازیان دەکا ڕاستە ئەمانە دوو جۆری جودان بەڵام دەکەونە ژێر یەک جنسەو ڕەنگەکانە وەکو : « شێروان چاکەتی زەردەو کراسی سپیە »

٢ - دژ یەک بن : واتە دوو شتی تەواو پێچەوانەیان تێدابێ وەکو هەستان و دانیشتن . تاو نا ڕاستەو درۆ . وەکو ( مامۆستا بەڕێوەبەر ڕۆیشت )

٣ - نیمچە دژیەک بن وەکو زەوی و ئاسمان . ئەمانە ئەگەر چی لە بەرزی و نزمیەوە جیاوازیان زۆرە . بەڵام وەکو دژیەک نین هەمیشە

ستراینەوە وەکو : ( ئاسمان دەگری و زەوی پێ دەکەنێ )
ەندی ئەندێشەیی ئەوەیە کە پەیوەندی نێوان ڕستەی یەکەم و دووەم
ەندییەکی ئەندێشەیی بێ . لەوێش ئەوەیە کە دوو شت یا زیاتر بە هۆی
ندێشە کاتێکەوە لە مێشکی تاکێکدا کۆ بێنەوە . هۆی کۆ بوونەوەی
ەکانیش بە گوێرەی کابرا دەگۆڕێ . بە گوێرەی پیشەو پەروەردەو هەوای تی
یا دەگۆڕێ لە مێشکی جەنگاوەردا تیرو تفەنگ و دەمانچەو گوللەو
ڕو کوشتار کۆدەبنەوە . لە مێشکی نووسەردا کاغەزو قەڵەم و ووشەو
تەو مەرەکەب و شتی وا کۆدەبنەوە . لە مێشکی مامۆستاو قوتابیاندا پۆل و
ختەو تەباشیرو پرسیارو وەڵام و پرۆگرام کۆدەبنەوە

• •

**ابڕین** : ئەوەیە کە دوو ڕستە بەیەکەوە نەبەستینەوە ، بەڵکو لە یەکتریان
ببڕین . دابڕینەکەش لەبەر ئەوەیە چونکە هیچ هۆکێکی تایبەتی نییە
هەردوو ڕستەکە پێکەوە بلکێنێ . دوو ڕستەکە لەم شوێنانە لە یەک دادەبڕێن
ـ کە دوو ڕستەکە بە تەواوی یەکیان گرتبێ . ئەمەش پێی دەگوترێ :
کانی تەواو ( کمال الاتصال ) واتە هەردوو ڕستەکە لەم ڕووەوە یەکگرتووبن
ە خەبەری یا دارشتن . یا دەبێ هەردووکیان خەبەری بن ، یا هەردووکیان
ارشتن . وادەبێ کە ڕستەی دووەم جەختی ڕستەی یەکەم بێ . وەکو : ئەمە
او نییە ژنە . کە گوتت ئەمە پیاو نییە . مانای دیارە کە ژنە . بەڵام زیاتر
ەخت کردن ڕستەی دووەمی هێناوە کە پێ دادەگری ئەمە ژنە . بەم جۆرە
ستەی دووەم بوو بە جەختی ڕستەی یەکەم . گۆران دەڵێ :

لەو نیعمەتەی پێی داری

تۆزێکی ، نەك تەواوی .

ڕستەی یەکەم دیارە کە لەو نیعمەتەی خوا پێی داوە ( تۆزێکی ) دەوێ . جا

کە لە ڕستەی دووەمدا دەڵێ ئەنت تەواوی، ئەمەی بۆ ... دا ...
ئەگەتا هەموو کەس دەزانێ کە تۆزێك بوو مانای وایە تەواو نییە.
وا دێ کە ڕستەی دووەم ڕوونکردنەوەی ڕستەی یەکەم بێ وەکو:
«گزنەکە حەمەی لە خشتە برد، کاوڕێکی بە مریشك ان کری.»
لە ڕستەی یەکەم باسی ئەوە دەکا کە گزنەکە حەمەی تەفرەداوەو لە
خشتەی بردووە ئەگەر بەوەندە بوەستایە من و تۆ نەماندەزانی لە
بردنەکە چی یەو چۆن بووە بەڵام ئەو بەوەندە وازی نەهێناوە چۆنیە
خشتە بردنەکەی بۆ ئێمە ڕوونکردۆتەوە ئەویش ئەوەیە کە کاوڕێک
مریشك لێ کڕیوە بەم جۆرە ڕستەی دووەم بۆتە ڕوونکردنەوەی ڕ
یەکەم. گۆران دەڵێ:

دایە پار چەتە بووم چەتەی نیشتمان
لە شاخ هاتمە خوار
لەسەر ئەم پلوسکە مەنیجی چاو جوان
تووش بووم یەکەم جار

لە ڕستەی یەکەمدا دەڵێ «دایە پار چەتە بووم» تا ئێرە دیار نیە
چ جۆرە چەتەیەك... چەتەی نیشتمان یا دزی نیشتمان چە
ڕێگای ڕزگاری یا چەتەی ڕێگرو زەڵام کوژ جا بۆ ئەوەی ئەو
ئیحتیماله پەیدا نەبێ و بۆ ئەوەی چەتەکە دیار بێ چی یەو کێیە
لە ڕستەی دووەمدا ڕوونی کردۆتەوە دەڵێ «چەتەی نیشتمان»
جۆرە ڕستەی دووەم بوو بە ڕوونکردنەوەی ڕستەی یەکەم
٢ ـ کە دوو ڕستەکە تەواو جیاوازبن و لە یەك دابڕان بەو مەر
دابڕانەکە پێچەوانەی مەبەست نەگەیەنێ. دابڕانی تەواوی دوو ڕستە
دوو جۆرە

• یا [illegible] وەکو [illegible]

لێی خۆش دەبم ئـــەو دەرگەی لە بن پێی دەزدێتم • لێرەدا دوو رستەمان هەیە ئەم دوو رستەیە لێك دابڕاون هۆی دابڕانەکەش ئەوەیە کە لە رووی خەبەرو دارشتنەوە جیاوازن رستەی یـــەکەم دارشتنەوە - نەهێشتنە - رستەی دووەم خەبەرە نالی دەڵێ

شێخم وەرە دەر کاتی بەهارو گوڵو گەشتە
ایام لە گوڵزاری خەزان وەختی خــەزانە

( شێخم وەرە دەر ) رستەیەکی دارشتنە - فەرمانە - ( کاتی بەهارو گوڵو گەشتە ) رستەی خەبەرییە

• یا وەدەبێ کــە دوو رستەکە لـەرووی ماناوە لەیەك دوور بن و هیچ پەیوەندییان بەیەکەوە نەبێ هەر رستەیەك سەربەخۆ بێ وەکو

• چەتۆ توتابییە بەرە مامۆستایەکم دی ». کەمو زۆر پەیوەندی لە نێوان رستەی یەکەم و دووەمدا نییە هەریەکە لە لاشێك لێ دەکا و باسی شتێك دەکا هیچ شتێك نییە بیانگەیەنێتە یەك . بۆیە لەیەك دابڕاون

٢ - ئەگەر دوو رستە بێتن ، رستەی دووەم وەڵامی پرسیارێکی نەکراو بێت بەڵام لەگەڵ رستەی یەکەم تەواو لێی بووەشێتەوە لەم حاڵەتەدا دوو رستەکە پێیان دەگوترێ ( نیمچە لکاوی تەواون ( شبه کمال الاتصال وەکو : گوتی چۆنی ؟ گوتم : نەخۆشم سەرمام بووە . لە وەڵامەکەدا دوو رستەمان هەیە ( نەخۆشم ، سەرمام بووە ) رستەی یەکەم وەڵامی پرسیارێکی کراوە کە دەڵێ : چۆنی ؟ بەڵام رستەی دووەم وەڵامی پرسیارێکی نەکراوە دەبوا لێی بپرسن ( هۆی نەخۆشییەکەت چییە ؟ ) لەو حاڵە وەڵام بداتەوە سەرمام بووە . بەڵام بێ ئەوەی ئەم پرسیارە هەبێ وەڵامەکەی داوەتەوە ئەو رستەی دووەمەش کە وەڵامی پرسیارێکی نەکراوە ، لەگەڵ رستەی یەکەمدا دەگونجێ

[illegible]

چنگلی تریش هەن کــــە رستەیان تێدا لێك دادەبڕێ بــەلام ئێمە پەیوەندەمان واز هێنا .

## پوختەی ئەم بەشـە ..

پێکەوەنانو دابڕین بایەخێـکی زۆری هـەیـە لە زانـستی ڕەوانبێژیدا چونکە بە هۆی ئەم پێکەوەنانو دابڕینە تا ڕادەیەکی زۆر مانای رستەکان ئاشکرا دەبێو لـە ئالۆزیو تێکەلاوی دوور دەکـەوێتەوە . پێکەوەنـان ئەوەیە دوو رستەیە بە هۆی ئامرازی هەتفەوە بە یـەکەوە ببەستینەوە ئەمەش لە بەر ئەوە دەکەی چونکە دوو رستەکـە حوکمێکیان لە نێودا هەیە تا حوکمەکە بە سەر هەردووکیان دابکشێ ئەو دوو رستەیەش کە بە یەکەوە دەلکێن یا لە ڕووی خەبەرو داڕشتنەوە هاوچەشن یا جیاوازن ئەو پەیوەندەش کە بە یەکەوە دەیانبەستێتەوە یا پەیوەندی ژیرییە یـا رامانییە یا ئەندێشەیی

ئینجا دابڕین . دابڕینیش ئەوەیە کـە دوو رستە تـەواو جیاوازبنو هیچ پەیوەندییان لە نێودا نەبێو نزیش نـە کانی نووسەرو ئاخاوتندا لە یەکیان جودا بکەیتەوە دوو رستەکەش ئەو کاتە دا دەبڕێن کە لە بارەی خەبەرو داڕشتنەوە وەدابن بەمەرجێ دابڕینەکە مانای مەبەست بشێوێنێ یا رستەی دووەم جەختو ڕونکردنەوەی رستەی یـەکەم بێ یـا ئەوەتە رستەی دووەم وەلامی پرسیارێکی نەکراو بێو لە گەل رستەی یـەکـەمدا ڕێك بکەوێ .

() () ()

# ڕەوانبێژی
## لە ئەدەبی کوردیدا

بەرگی یەکەم / ڕوونبێژی / بەغدا / ١٩٧٢

بەرگی دووەم / جوانکاری / هەولێر / ١٩٧٥

بەرگی سێیەم / داتاناسی / سلێمانی / ١٩٧٩

نرخی [ ٥٠٠ ] فلسە

لەکتێبخانەی نیشتمانی ـ بەغدا، ژمارە ١١١٣ / ١٩٧٩ دراوەتێ

سلێمانی / چاپخانەی کاکەی فەلاح